تەنها بۆ دیاریە

# ئاگادار
# ئاگادارکردنەوەی بێ ئاگایان
# ومژدە پێ دانی زانایان



محمد صالح عبدالرحمن

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکی : سوپاس و ستایش بۆ پەروەردەگاری جیهان درودوو سلاویش لەسەر پێغەمبەرو یارانی ئەوانەی دوای دەکەون بە چاکە تـــا رۆژی دوایی

تەماشاکردنی ئەو هەموو بیدعەیـەی کـە لـە نێـوان موسڵمانان بلاَوبۆتـەوە لـە بەندایـەتی کردن و کارو کردەوە و لاسایی کردنـەوە کە کردویانەتـە ئـاین ، وە ئاینیش لێ یان بەری یە ، ئەمنیش بە ئەرکی سەر شانی خۆم زانـی ئەو کتابە بلاَو بکەمەوە وبیکەمە دیاری موسڵمانان و کار بەو زانینە بکەم کە خوا پێی داوم بلاَوی بکەمەوە وەکو خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وأما بنعمة ربك فحدث ﴾ .

چونکە نیعمەتی خوای گەورە لە سەر ئێمە هێندە زۆر لە ژماردن نایە یەك لەو نیعمەتانە ئەمنی کردۆتە خزمەتکاری مزگەوتێ لە پەنجا ساڵی یـەوە هـەتاکو ئێستا کە لە هەشتا ساڵی نزیك دەبمەوە وە تەندروستیم زۆر باشە و هەر پێنج هەستەکانیشم ساغ و سەلامەتن ، ئەوەش هەر نیعمەتە . وە هەمووتان دەزانن هەرچی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتووە هەر ئەوە ناوەرۆکی ئاینە و لە گەڵ ئەو شتانەی هەر چوار خەلیفەکانی ڕاشیدین لە سەری ڕێك کەوتوون و هەر چوار مەزهەب و هەرچی زاناکان کۆ بونەتەوەو موسلمانان لە دەوڵەتە ئیسلامی یەکان لە سەری دەڕۆن . بەلاَم زۆر بەداخەوە هەندێ کەس دەبینی پرۆگرامی قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەئەستۆ ناگرن وەکو پێویستە بەڵکو خویان بەلاسایی کردنەوەو عادەت و بیدعە وەگرتووە کەپێچەوانەی ئاینە کەچی بەئاینیشی تێ دەگەن ، بۆ نمونە وەکو ئەو شتانەی ئەمرۆ لەنێومان دەکرێ لەڕێ و ڕەسمی تازیە دانان و ڕێز نەگرتنی مزگەوت و گۆڕبەگەورەگرتن و جغارە خواردن و کردنی هەموو جۆرە یارییەك و داهێنانی جۆرە سۆفی یایەتیەك کە لە گەڵ شەرع ڕێك ناکەوێ دەفە لێدەدەن و شیری لە خۆ دەدەن و زۆر شتی تر کە هیچ ئەسلەکی لە ئیسلامدا نیە کەدوایی درێژە بە باس کردنیان دەدەین . بەلاَم بە پێچەوانەوە ئەو شتانەی شەرع فەرمانی بە کردنیان داوەو بە باشیان دەزانێ وەکو ڕووکردنە خوا بە دڵسۆزی لە هەموو

کارو کردەوەیەك و بەجێ هێنانی پێویستی یەکان بەبێ ڕیا کردن و هاوبەش پەیدا کردنی شاراوە ، یا بەدڵ ترسان لە خوا لە ناو نوێژکە گیانی نوێژکردنە و کارو کردەوە کردن بە ئەقی قورئان و سوننەتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) تاوای لێ دێ کردەوە کردن بە قورئان و سوننەت زۆر ئەبێ و بیدعە کردن کەم ئەبێتەوە بەڵێ زۆر جاران وەیە خۆ بە قورئان و سوننەت بەستانەوە لای هەندێ کەس بە شتەکی نامۆو بەلە ئایین ئەرچون دێتە ژمار ئەوەش ڕەنگدانەوەی ساردێتی خەڵکەکەیە کەوا لە کۆمەڵگای خۆمان بە چاو ئەیبینین . وە داواش لە خوێنەری بەرێز ئەکەم چاوپۆشی لە کەم و کوڕیو هەڵەکانم بکا بەتایبەتی لە لایەنی زمانە وانی ( مەبەستی دانەر لە ئەسڵی عەرەبی یەکەیە) وەلە کۆتایی دا لە خوای گەورە داواکارم دڵمان ڕۆشن بکاو شارەزای ڕێگای ڕاستمان بکا چونکە هەر ئەو یارمەتی دەرەو تەوفیق هێنەرەوە پشتیشمان هەربەو بەستاوە وە دوا دوعاشمان ( أن الحمد لله رب العالمين ) ە .

# بەشێك لە بیرو باوەڕ

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ الم ، ذلك الكتاب لا ريب فيه هدى للمتقين الذين يؤمنون بالغيب و يقيمون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون ﴾ [1]

واتە الم ، ئەو کتێبە هیچ گومانی تێدا نیە ، ڕێنمونی یە بۆ لە خوا ترسان ، ئەوان بڕوایان هەیە بە نادیار ، نوێژان ڕادەگرن و لەوەی پێمان داون خەرجی ئەکەن بیرو باوەر (الايمان) لە زمانی شەرعدا بریتی‌یە لە بەڕاست زانینی بە دڵ و دان پیاهێنان بە زمان و کارو کردەوە کردن بە پایەکان (الارکان) لە ئەبو هورەیرە دەگێرنەوە (ﷺ) ووتی ڕۆژێ پیاوێ هاتە ناو خەڵکی بە پێغەمبەری خودای ووت بیرو باوەر چی یە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی باوەڕت هەبێ بە خواو بە فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و بەگەیشتنەوە خواو پێغەمبەرەکان و

١) سورة البقرة - الآية ١-٣

باوەرت هەبێ بە ڕۆژی دوایی دەگێرنەوە پیاوێ لە (الحسن) ی پرسی و ووتی ئەرێ تۆ بڕواداری ؟ (الحسن) ووتی باوەڕ دوو جۆرە ، جا ئەگەر پرسیارم لێ دەکەی لە باوەڕهێنان بە خواو فریشتەکان و پێغەمبەرەکان و ڕۆژی دوایی بەم جۆرە بڕوادارم ، ئەگەر پرسیاریشم لێ دەکەی لە فەرموودەی خوای گەورە ﴿ إنما المؤمنون الذين اذا ذكر الله وجلت قلوبهم و اذا تليت عليهم آياته زادتهم ايمانا وعلى ربهم يتوكلون الذين يقيمون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون . أولئك هم المؤمنون حقا لهم درجات عند ربهم و مغفرة و رزق كريم ﴾ (٢)

واتە : بەڕاستی بڕوا داران ئەوانەن کاتی یادی خوا کرا دڵیان دەترسێ وە کاتێ ئایەتەکانی خوا بەسەریاندا بخوێندرێتەوە بڕوایان زیاد دەکا وەپشت هەر بە پەروەدگاریان دەبەستن ئەوانەن نوێژ ڕادەگرن لە وەی پێمان داون خەرجی دەکەن ئەوانە بەڕاستی بڕوادارن چەند پلەیەکیان لای پەردگاریان هەیە لێخۆش بوون و ڕسقەکی بەرێز سوێندم بە خوا نازانم لەو جۆرەیانم یان نا .

فەرموودەی خوای گەورە ﴿ ليبلوكم ايكم احسن عملاً وهو العزيز الغفور ﴾ (٣)

واتە : هەتا تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی جوانترە وە هەر ئەو کار بەدەست و لێخۆش بووە . لە تەفسیر کردن (احسن عملاً ) باسی زۆر ڕوویان کردەوە ، یەکێکیان ، ئەوەیە دەبێ پاکتر و ڕاستر کردەوەی ، چونکە ئەگەر کردەوەیان بێ‌ی و ڕاست نەبێ وەرناگرێ ، وە ئەگەر ڕاست بێ‌و پاك نەبێ وەرناگیرێ جا پاك بێ‌و دەبێ بۆ خوا بێ و ڕاست دەبێ لەسەر سوننەت بێ (٤)

دووەمیان : خوای گەورە لە ئایەتی ﴿ انما المؤمنون ... اِلى آخر الآية ﴾ باسی کردوە ، مرۆڤ نابێتە بڕوادار مەگەر بەو پێنج سیفەتانە نەبێ کە ئەمانەن :- ترسان لە خوا ، دڵسۆزی لە ئاینی خوا ، پشت بەستان بەخوا ، نوێژ ڕاگرتن ،

---

٢) سورة الانفال - الآية ٣

٣) سورة الملك - الآية ٢

٤) تفسير الكبير - سورة الملك

زەكات دان لەبەر خوا ، وە لە سەرەتایی ئایەتەکە باسی ئەو شتانەی کردەوە کە بەلگەنە لەسەر کورت هەلێنان (الحصر) کە بریتی‌یە لە ﴿ إنما المؤمنـون ... ﴾ هەتا دوایی ئایەتەکە .

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وما خلقت الجن والانس الا ليعبـدون ﴾ [1] واتە : من جنۆکەو مرۆڤم دروست نەکردووە مەگەر بم پەرستن و بەتاقم بزانن . ئەوە ئەوبەتاك زانین( التوحيـدة) ەیە پێغەمبەرەکان پیێ هاتوون ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) ئەمەش دابەش دەبێ بۆ سێ جۆر : یەکتا ناسی پەروەردگاریتی و یەکتاناسی خوایەتی کردون و یەکتاناسی ناوو سیفەتەکان . بەگوێرەی یەکتاناسی پەروەردگاریتی ئەوەیە باوەرت هەبێ خوای گەورە بەدیهێنەر بەندەکانە رسق دەریانە ، ژیاندەریانە ، مرێنەریانە . بەلام یەکتاناسی خوایەتی کردن بریتیە لەیەکتاناسی خوا لەبەندایەتی کردن ، ئەمەش ئەو یەکتاناسی خوایە پێغەمبەرەکان بۆلای گەلەکانیان پیێ هاتوون ، چونکە پێغەمبەرەکان هاتوونە بۆ بریاردانی یەکتاناسی پەروەردگاریتی خوا کە گەلەکانیان باوەریان پێ هەبووە وبانگ هێشتنیان کردون بۆ لای یەکتاناسی خوایەتی کردن ، جا پێویستە لە سەر هەموو موسلمانێك جیاوازی بکا لەنێوان یەکتاناسی پەروەردگاریتی و یەکتاناسی خوایەتی کردن ، چونکە زۆر زانا کان بێجگە لە نەزانەکان تێدا تووشی هەلە بوونە جا ئەو کەسانە بەهەلەدا چوونە ووشەی خوا (الاله) یان بەتوانا لەسەر شت داهێنان یابە بەدیهێنە یاخاوەن دار مانا لێداەتەوە . بەهەر حال مانای (الاله) بۆ هەموو پەرستراوەکی بەهەق و ناهەق بەکار هاتووە . لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بەهاوبەش پەیدا کەرەکانی قورەیشی فەرموو﴿قولوا لااله الا الله تفلحوا وتملكوا بها العرب وتدين لكم بها العجم﴾ واتە : ( بلێن (لااله الا الله) پێ دەبنە خاوەنی عەرەب و عەجەمیش پێ دێنە دینەکەتانەوە ) بەلام ووشەی (الله)هەر تەنها بۆ خوای گەورە بەکار هاتووە .

---

٢) سورة الذاريات ــ الآية ٥٧

بەڕاستی هەتا بڵێ ی شتەکی نەفامی‌یە ئەویش ئەوەیە زۆربەی خەڵك شایەتی دەدەن بەرستەی ( لااله الا الله وان محمدا رسول الله) نازانی مانای ئەم دوو ڕستەیە هەر چیشە ، جا ئەگەر بیان زانی بابە مانای (لااله الا الله) یانی هیچ پەرستراوێکی بەهەق لە هەبوون (وجود) دانیە تەنیاخوا نەبێ ئەگەر دەیانزانی ئەوەی بۆ وەلی‌یەکان و سەیدەکان و گۆری پیاو چاکان دەیکەن وەکو ئاژەڵ کوشتنەوە نەزر کردن و بەتەبە ڕوك زانینی خۆڵی سەر گۆرەکانیان و سوڕانەوە بەدەوری گۆرەکانیان و داوای پێویستی کردن لێیان ئەوەبە خوا دانانی ئەو پیاو چاکانەیە ئەوە قەت وەیان نەدەکرد ، چونکە خوایەتی کردن ناشێ‌بۆ هیچ کەسێ تەنیا خوا نەبێ ، خۆزگە دەیان زانی ئەو جۆرە کردەوانەی ئەوانەدەیکەن ئەوەهاوبەش پەیداکردنی گەورەیە بۆ خوا ﴿ اعاذنا الله منه ﴾ وەفەرمووده‌ی خوای گەورە ﴿ ان الله لايغفر ان يشرك به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء﴾[٢] واتە بەڕاستی خوا لەو کەسە خۆش نابێ هاوبەشی بۆ دابنێ ، وەخۆش دەبێ بێجگە لەوە هەر کەسێك بیەوێ . ئەو ئایەتە گەورەترین شتە پێویستە لەهاوبەشی دانان بترسی چونکە خوای گەورە لێخۆش بوونی لەهاوبەش پەیداکەران بڕیوە وەپێویستی کردووە هەمیشە لەناو ئاگر بمێنێتەوە ئەو مانەوەشی رەها کردووەو بەهیچی نەبەستۆتەوە . بەلام ئەو کەسی بەهاوبەش پەیداکەری نەمردووبێ و چوونی بۆ بەهەشت ئەوە شتێکی ترە . بەلام ئەگەر کەسێ خاوەن گوناهی گەورە نەبووبی وە سوور نەبووبێ لەسەری‌و لەسەر ئەم شێوە نەمردوو بوبی ئەوە ، ئەوە لەژێر خواستی خوا دەمێنێتەوە ئەگەر بەخشی ئەوە دچێتە بەهەشت ئەگەر ناعەزابی دەدا بەئاگر دوایی دەری دەهێنی وەدیباتە بەهەشت . جائەگەر کەسێك هاواری لەمردوێك یالەکەسێکی نادیارو بودڵ رووی نێ‌کردوو چۆن یەکە داوای شتی لێ بکات یان نا ئەوە هاوەش پەیداکردنەو خوا لێی خۆش نابێ هەر لەبەر ئەمە خوا تکا کار (الشفعاء)ی لەنێوان خۆی‌و بەندەی

---

٢) سورة النساء ـ الآية

یاساغ کردوه بەتوندی و نکوڵی کردووە لەو کەسانەی ئەو کردەوانە دەکەن چونکە پێچەوانەو دژی دڵسۆزیە کەبریتی‌یە رووکردنە خوا بەدڵ لەهەرچی بەندە لێی دەترسی و جێگەی ئومێدیەتی‌و دەیەوێ پێ لەخوا نزیك بێتەوە و دینداری پێ بکا . لە (عمران بن حصینی) وە (ﷺ) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی دی بازنەیەکی لەدەستی بوو فەرمووی ئەوە چی‌یە ؟ ووتی بۆ لاوازی قۆڵە (الواهنة) پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی لەدەستت کەوە چونکە ئەم بازنە تەنها لاوازیت زیاد دەکا ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بمری قەت رزگارت نابێ [1] وە ( لابن ابی حاتم ) لە ( حذیفة ) ی (ﷺ) پیاوێکی دیت داوەکی لەدەستی بوو لەبەر تاهاتن داوەکەی پساند لەدەستی‌و ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ وما یؤمن أکثر هم بالله الاوهم مشرکون ﴾ [2] واته : زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن مەگەر ئەوانە هاوبەشی پەیدا دەکەن . لە (ابن مسعود) (ﷺ) ووتی گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو ﴿ ان الرقی والتمائم والتوله شرك ﴾ [3] . واته : بەڕاستی نوشتە کردن و کلاّو و کوژەکە چەوری و شیرینی لەهاوبەش پەیدا کردنن جا هەر کەسێك رووی دڵی وەر بگێرێ بۆ لای کەسێ بێجگە لەخواو داوای سوود گەیاندنی لێ بکا یاداوای زیان لێ لادانی لێ بکا ئەو کەسە هاوبەشی پەیدا کردووە بۆ خوا وە (ابن مسعود) وتویەتی ( ئەگەر سوێند بەخوا بەدرۆ بخۆم پێم خۆشترە لەوەی سوێندی بەغەیری خوا بەڕاستی بخۆم . خۆ دیارە سوێند بەخوا خواردن بەدرۆ بەگەورەترین گوناح دێتە ژمارە ، بەلاّم هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا لەگوناحە هەرە گەورەکانە بابەدیمەن بچوکیش بێ . وەلە (عمر بن الخطاب) (ﷺ) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ من حلف بغیر الله فقد کفر ، او اشرك ﴾ [4] واته : هەر

١) رواه احمد بسند لاباس به

٢) سورة یوسف الایة ـ ١٠٦

٣) رواه احمد وابو داود

٤) رواه الترمذی وحسنه وصححه حاکم

کەسێ سوێند بەغەیری خوا بخوا ئەوە کافر بووە، یان هاوبەشی بۆ خوا پەیدا کردووە .

# بەشێك نیەت هەبوون لە کردەوە کردن چاکترە

بەڕاستی دڵ لە لاشە باشترە ، بۆیە کردوەی بە دڵ لە کردەوەی بە لاشە باشترە ، کەواتە نیەت هەبوون لە کردوە کردن باشترە .کردوە کردن لە سەر سێ جۆرانە ، فەرمانبەری ، گوناح کردن ، ڕێ پێدراو ، ( **المباح** )

جا بەنیەت هەبوون گوناح ناگۆڕێ ، جا بۆیە بابای نەفام نابێ بەو فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) بە هەڵە داچێ کە فەرموویەتی ﴿ **إنما الأعمال بالنيات** ﴾ واتە : کردەوەکان بە گوێرەی نیەتە وە بە نیەتیش گوناح کردن دەبێتە گوێ ڕایەڵی وەکو ئەو کەسانەی بە ماڵی خەڵکی چاکە دەکەن یا بە پارەی حەرام مزگەوتێ دەکەن ، بەلام گوێ ڕایەڵی لە بنچینەڕا پەیوەندی بە نیەت هەبوونەوە هەیە لە چاکە کردندا ، یانی لە بنچینەوە مەبەستی پێ بەندایەتی خوای گەورە بێ بۆیە نیەتی ریا کردن دەبێتە گوناح ، بەلام چاکە کردن بەزۆری نیەت هەبوون زۆر دەبێ بۆ نموونە وەکو ئەو کەسەی لە مزگەوت دانیشتووە نیەتی زۆری هەیە یەکەم : باوەڕی وایە ماڵی خوایە و مەبەستی پێ سەردانی خوایە وەکو پێغەمبەر فەموویەتی ( هەر کەسێ لە مزگەوت دانیشێ ئەوە سەردانی خوای کردوە وە هەقە لەسەر لێدراو (**المزور**) ) ڕێزی سەر لێدەری بگرێ . دووەم : نوێژ لە دوای نوێژ جا حاڵی چاوەڕوانی نوێژ وەکو ئەو کەسە وایە کە لە نوێژدابێ .

سێیەم : گوێ نەدان و چاوەڕوان و پاراستنی گشت ئەندامەکان لەو شتانەی پێویستت نینە . وە (ئیعتیکاف) یانی مانەوە لە مزگەوت بە نیازی خواپەرستی جۆرێکە لە گۆشە گیری لەبەر هەندێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ **رهبانية امتى القعود فى المساجد** ﴾ واتە : گۆشە گیری ئۆممەتی من لە مزگەوت دانیشتنە .

چوارەم : گۆڕینی دڵ بە گشتی بۆ لای خوای گەورە . پێنجەم : بێجگە لە خوا

هەرچی لە دڵ دایە دەرکەی و کەسکی دەی . شەشەم : مەبەستی سوود وەرگرتن لە زانست یا فەرمان دان بە چاکە بێ و قەدەغە لە خراپە بێ . حەوتەم : سوود لە برایەکی ئاینی وەربگری ، چونکە سوود وەرگرتن لە ئەهلی دین دەستکەوتێکە . هەشتەم : لە شەرمی خوا واز لە گوناح کردن بێنی بەم جۆرە نیەت زۆر دەبێ و هەموو گوێ ڕایەڵی یەکانی تریش بۆ خوا بەم گوێرە قیاس بکە . وەبزانە : کاتێ بابای نەفام گوێ ی لە ڕووەکانی بەڵگەی ژیری (العقلیة) و بەڵگەی قورئان (العقلیة) دەبێ ئەو نەفامە وەتێ دەگا هەموو شت نیەتی دەوێ ، ڕەنگە لە کاتی دەرس فێر بوون و بازرگانی کردن لە دڵی خۆی نیەت بێنێ و بڵێ لە بەر خوا دەیخوێنم یا بازرگانی دەکەم گومانی واشە ئەمە نیەت هێنانە ، ئای چەند دوورە (هیهات) ئەوە هەر قسەی دەرونە یا قسەی زمانە وەنیەت هێنان فڕی بەسەر ئەو شتانەوە نیە ، چونکە نیەت هێنان ڕوو تێ کردن و مەیل کردنە بۆ ئەو شتەی لات ئاشکرا بووە ، کەمەبەستی دڵ و دەروونی تێدایە یا ئەوەتە لە دونیا یا لە دوا ڕۆژ ، جا کەواتە چەسپا نیەت هێنان دەربڕینێکە نەبەقسەی زمانە نەبەقسەی دڵ بەڵکو دەربڕینێکە لە بەدەست هێنانی ئەو مەیلە ئەمەش کردەوەیەکی نادیارە ، نیەت هێنان خەڵکی لە گوێ ڕایەڵی کردنی خوا چەند جۆرێکی هەیە ، جۆرە خەڵکێکی وا هەیە لە ترسی ئاگری کردەوە دەکا ، جۆرێکی وا هەیە بە کردەوەکانی ئومێدی بەهەشتە بەڵام بەندایەتی کردنی خاوەن هۆشەکان لە زیکر کردن و بیر لێ کردنەوە لە گەورایەتی خوا تێ پەڕناکا. وە هەموو کردەوەکان دوو پاتەی دەکەنەوە [1]

وە فەرموودەوی خوای گەورە ﴿ وعملوا الصالحات ﴾ واتە : کردەوە چاکەکان وتراوە کردەوەی چاك دەبێ ئەو چوار شتەی تێدا بێ : زانست و نیەت و سەبرو دڵسۆزی ، وەهەروەها لە بارەی نیەت هێنانەوە هەقیقەتی خۆشوشتنی شەرعی تەواو نابێ مەگەر بە دوو فەرمان نەبێ .

یەکەم : نیەت هێنان چونکە نیەت هێنان عیبادەت لە عادەت جیا دەبێتەوە وەنیەت هێنانیش کردەوەیەکی دڵی رووتەو ( فڕی بەسەر زمانەوە وەنیە ) وە ئەو شتانەی خەڵك تێکەڵی بە نیەت هێنانیان کردوە ئەوە عادەتیان پێوە گرتووە بۆ نموونە وەکو نیەت بە زمان هێنان ئەوە شتەکی تازە پەیدا بووە و هیچ ئەسڵێکی شەرعی نیە بەڵکو پێویستە لێ دوور کەوتنەوەو واز لێ هێنانی .

دووەم : شوشتنی هەموو ئەندامەکانی لاشە [٢] .

# بەشێك لە گەورایەتی زانین و زانایان

(ابو هريرة) و (ابن عباس) ووتیان پێغەمبەر (ﷺ) لە شاری مەدینە پێش مردنی وتارێکی توندی بۆ داین و فەرمووی فێرە زانین بیۆ خۆی بەکەم بزانیێ و بەندەکانی خوا فێرە زانین بکاو مەبەستی رەزامەندی خوا بێ ، کەس لە بەهەشت لەو کەسە پاداشتی چاکتر نیەو پلەی لەو بەرزتر نیە وە هیچ پلەو پایەکی بەرزو بەنرخ نیە مەگەر بۆ خاوەن زانینە و لە بەهەشت هەرچی بەش و بارەی باشەو پلەی بەرزە بۆ ئەوە [٣] وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە جوبرائیلم وت ئۆممەتەکەم چ کردەوەیەك بکەن لە هەمووی چاکترە ؟ فەرمووی فێرە زانین بن ووتم ئەدی دوای وی وتی تەماشاکردنی زانایان وتم ئەدی دوای وی وتی سەردانی زانایان دوایی وتی هەر کەسێ لەبەر خوا فێرە زانین بیۆ بەو زانستە مەبەستی چاك کردنی موسڵمان بیۆ مەبەستی دونیا نەبێ ئەمن کەفیلی ئەو کەسەیمە دەچێتە بەهەشتێ [٤] .

(ابن عمر) دەڵێ گەورایەتی زانا لەسەر نەزانان حەفتا پلەی هەیە ، نێوان هەر

(١)- تفسير الكبير المجلد ٢ سورة البقرة الآية ١١٢

(٢) - فقه السنة ص٢٣ (٦) تفسير الخازن ص٥٠٤

(٣)- تفسير الكبير ص١٨٩

(٤) - المصدر السابق - سورة البقرة الآية ٣٣

پلەیەك سەرە ولأغێکی (٧٠) ساڵمیە ئەمەش لە بەر ئەوەیە شەیتان بیدعەیەکی دادەنێ زانا تێکی دەدا بەلأم بەندەی نەزان ڕووی تێ دەکا ، ئیمامی (الشافعی) و (ابو حنیفة) وتوویانە ئەگەر زاناکان وەلی خوا نەبن دیارە خوا وەلی نیە ئەمەش ئەو زانایانەن کە کردەوە بە زانینەکەیان دەکەن [٥] . (سلیمان) وتوویەتی : هێشتا خەڵك خێری یان پێوەیە هەتا زانا مابێ و فێریان بکەن ، ئەگەر کەس نەما فێری‌یان بکا ئەو کاتە خەڵك لە ناو دەچن . بە (سعید بن جبیر)ی‌یان ووت نیشانەکانی لە ناو چوونی خەڵکی چی‌یە ؟ سعید ووتی نەمانی زانایانە (٦) ، (ضرار بن عمرو) ووتی ئەگەر قەومەك واز لە زانین و ئەهلی زانین بێنن و بچن لە محراب .

دانیشن و نوێژ بکەن وبەڕۆژو بن هەتا پێستەیان لەسەر هێسکیان ووشك دەبێتەوە ، ئەگەر پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەریان کرد (ﷺ) ئەوە لە ناو دەچن ، سوێند بەو خوایەی کە خوای ترنیە هیچ کەس نی‌یە بە نەفامی کردەوە بکا ئەوە فەسادی کردنی پترە لە چاکی کردن [١] . خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وعلم آدم الاسماء کلها﴾ [١] واتە : خوا هەمموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد وە فەرموویەتی ﴿ انما یخشی الله من عبادە العلماء﴾ [٢] واتە : بەڕاستی لە نێو بەندەکانی خوادا تەنیا زانایان لەو دەترسن ئایەتەکە بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر ئەوە کە تەنیا زاناکان خەڵکی بەهەشتن لەبەر ئەوەی ووشەی (انما) بۆ کورت هەڵێنان (الحصر) ە هەروا بەڵگەشە لەسەر هەندێ تەنیا زاناکان لە خوا دەترسن . وە ئایەتێکی تر ئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ ذلك لمن خشی ربه ﴾ [٣] واتە : بەهەشت بۆ کەسێکە لەپەروەردگاری خۆی ترسا بێ ، بەڵگەیە لەسەر

(٥) الصاوی علی الجلالین - مجلد- مجلد٢ - ص١٩٥

هەندێ بەهەشت بۆ خەڵکێ لە خوا ترسە پێچەوانەو دژایەتی دێ کە بەهەشت بۆ غەیری لە خوا ترسان بێ ، ئەو دوو ئایەتە بەڵگە نەلە سەر ئەوەی کەس خەڵکی بەهەشت نیە تەنیا زاناکان نەبن ، وەبزانە ئەو ئایەتە ترساندنەکی توندوتیژی تێدایە چونکە چەسپاندویەتی ترسان لە خوا پێویستی بەخواناسیە وە لە کاتی لە خوا نەترسان دیارە خوای نەناسی‌یە وە ئەو باسە وردە دەبێ ئاگاداربێ چونکە ئەو زانینە هۆی لە خوا نزیکی و لە خوا ترسانە [٢] . (الربیع بن انس) ووتی هەر کەسێ نەترسی ئەوە نەزانە . (مجاهد) وتویەتی : زانا ئەو کەسەیە کە لە خوای گەورە بترسێ ، (ابن مسعود) وتویەتی بەسە بە لە خوا ترسان زانابی وەبەلەخوا نەترسان نەزان بی ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ من ازداد علما ولم یزدد هدیً لم یزید من الله الابعدا ﴾ [٣] واتە : هەر کەسێ لە زانین زیادی کرد هیدایەتی لە گەڵ زیادی نەکرد ، ئەوە زانینەکە زیاتر لە خوای دور دەخاتەوە . (عبد الله بن عمر) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە دەفەرموێ (ئەمن زانینی خۆم بۆ ئەوە لەسەر دانەناون پێ عەزابتان بدەم بەڵکو دەڵێم چۆن فێرە ئەو زانینە بوونە ئەوها برۆنە بەهەشت ) وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی دوو جۆرە خەڵك هەیە ، زاناو ئەوەی دەیەوێ فێرە زانین بێ ، خەڵکەکەی تر هەموو گێل (همج)ن و هیچ خێریان پێوە نیە [٤] وە زۆر لە سۆفیەکان جیاوازی دەخەنە نێوان شەریعەت وهەقیقەت ، دیارە ئەو سۆفیەلکانە زۆر نەفامن چونکە شەریعەت هەر هەمووی هەقیقەتە وە پێشەوا (امام غزالی) لە کتابی (أحیاء العلوم) دا ئاگاداری ئەو صۆفیۆکانەی کردوە و وتوویەتی :- هەر کەسێ بڵێ هەقیقەت پێچەوانەی شەریعەتە پاشی دیــــار

(١) کتاب تلبیس ابلیس

(٢) تفسیر الکبیر - سورة البقرة الآیة ٣٢

(٣) تفسیر الکبیر - سورة الاعراف - الآیة ١٧٦

(٣) تفسیر الکبیر - سورة البقرة

پێچەوانەی نادیارە ئەو کەسە لە کافر بوون نزیک ترە نەك لە بڕواداری .[1]
پێویستە لەسەر بڕواداران پێغەمبەرو زاناو وەلیـەکان و شـەهیدەکان و پیـاوە چاکەکانیان خۆش بوێ بەڵام نابێ داوای بە هاناوە هاتن و یارمەتی لێکردن و زیان لێ لادان و سودگەیاندنیان لێ بکەن ئەگەر وا بکەن ئەوە دەبنە هاوبەش پەیدا کەر (نعوذ بالله من الشرك) وە (معاوية) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی ﴿ من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين ﴾[2] واتە : هەر کەسێ خوا بیەوێ توشی خێری بکا لە ئاین تێ دەگا . ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پلەو پایەی لە ئاین گەیشتن خوا نای داتە کەسێ مەگەر بیەوێ ئەو کەسە توشی خێرەکی گەورە بێ ، وە تێگەیشتن لە ئاین بریتیـیە لە زانینی بنچینەکانی ئیسلام و حەلاڵ و حەرام و تێگەیشتنی مەرجەکان ، بەڵێ ئەگەر کەسێ لە ئاین نەگەیشت دیارە خوا تووشی خێری نەکردوە ، وە ئەو قسەیەش لە ریوایەتی (ابی يعلى) دا هاتووە ( هەر کەسێ لە ئاین نەگەیشتبێ خوا هێندە گرنگی پێ نادا ) وەئەو فەرموودەیە بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوەی شەرەفی لەئاین گەیشتن و ئەو کەسانەی لە ئاین گەیشتوون گەورەترە لە هەموو زانینەکانی ترو زانایەکانی تر . وە مەبەست لە ئاین گەیشتن ئەوەیە یانی لە قورئان و سوننەت گەیشتن[3] پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ لفقيه واحد أشد على الشيطان من الف عابد ﴾[4] واتە : زانا لەسەر شەیتانی لە هەزار عابیدی بەهێزترە .

(ئاگادارییەکی گرنگ): – ساڵانە لە قوتابخانەکان لە گشت قۆناغەکانی خوێندن ژمارەیەکی زۆر کتێب دابەش دەکرێت بۆ قوتابیەکان لە وانەش خوێندنەوە و تەفسیری قورئان و پەروەردەی ئیسلامی ئەمەش ئایاتی پیرۆزو ناوی خوای گەورەو ناوی پێغەمبەرو فەرمودە بەرێزەکانی تێدایە ، بەڵام ئەوەی جێگای داخە ماوەیەك دەبینی پەڕەکانی بەسەر جادەو کۆڵانان بڵاو دەبنەوە یان ئەو پەڕانە بۆ گوڵەبەڕۆژە فرۆشتن بەکار دێت و پاشانیش فڕێ دەدرێتە ڕێگاو بان و شوێنی پیس و خەلکی بەسەریا تێ دەپەڕن کە ئەمەش گوناهێکی گەورەو بەڵایە کە لەم زەمانە روو دەدات .

١ – تلبيس ص ٢٢٤ ٤ – متفق عليه ٣ ) سبل السلام / الجزء الرابع ٤ ) تفسير الكبير المجلد ٢٨ ص١٣٩

زانای گەورە ( صاوی ) لەسەر تەفسیری جەلالەین دەفەرموی بە گەورە دانانی ناوی خوا پێویستە هەروەها بە پاك زانین لە هەموو کەم و کورتی یەك بۆیە شەرع زانەکان دەڵێن کەسێك ناوی خوای گەورەی دیت لەسەر کاغەزێك نووسراو کەوتبوە شوێنێکی پیس بەلایا تێ پەڕی و بە جێ ی هێشت پێ کافر دەبێت چونکە بەسووك دانانی ناوەکانی خوا وەك بە سووك دانانی خوایە ( پەنابەخوا ) لەبەر ئەوەی ناو دەلیلی ناولێنراوە بۆیە ڕووندەکەمە رابەرو بەر پرسەکانی پەروەردەو فێر کردن و بریانی مامۆستا ی وانەکانی ئایینی چارەیەکی ئەم بابەتە گرنگە بکەن ئەوەش بە هاندانی قوتابیەکان بۆ پاراستن و بە پاك راگرتنی تەفسیری قورئان و کتێبە ئاینی یەکان لە کۆتایی سالیش وەرگرتنەوەیان لە قوتابیان و دانانی لە کۆگاکان بە شێوەیەك لە گەل پێزێی ئەم کتێبانە بگونجێ هەروەها نەهێشتنی و لەناوبردنی چاپە کۆنەکان بە ڕێگەیەکی دروست و شەرعی نەك فڕێدان و بڵاوە پێکردنی .

## بەشێك لە قەدەغە کردنی بیدعە و شتە تازە پەیدا بووەکان

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ فماذا بعد الحق الا الضلال ﴾ [1] واتە : لە دوای هەق چی تر هەیە مەگەر گومرایی نەبێ هەروەها فەرموویەتی ﴿ ما فرطنا فی الکتاب من شئ ﴾ [2] واتە : ئێمە کۆتایی مان نەکردوە لەم کتێبەدا هەروەها فەرموویەتی ﴿ فان تنازعتم فی شئ فردوه الی الله و الرسول ﴾ [3] واتە : ( جا ئەگەر لە شتێك تووشی جیایی بیرو باوەڕ بوون بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ) واتە : قورئان و سوننەت هەروەها فەرموویەتی ﴿ وإن هذا صراطی مستقیماً فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بکم عن سبیله ﴾ [4] واتە : بێڕاستی ئەمە ڕێگای ڕاستی منە جا بەوەدا بڕۆن بەرێبازی تردا مەڕۆن ئەوەکو لە ڕێگای خوا جیاتان بکاتەوە . لە عائشە (رضی الله عنها) وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ من أحدث من أمرنا هذا ما لیس منه فهو رد ﴾ [5] واتە : هەر کەسێ شتێك لە فەرمانی ئێمە دابنی ئێمە وامان نەکردبی ، ئەوە ئەدرێتە دواوە لە (عبد الله بن عمر) وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ من رغب عن سنتی فلیس منی ﴾ [6] واتە هەر کەسێ لە سوننەتی من لابدا ئەوە لە من نییە . (عرباض) وتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژەکی نوێژی بەیانی پێکردین دوایی ڕوی تێکردین و زۆر بە توندی ئامۆژگاری کردین هەتا چاو ئاویان لێ هات و دڵ ترسان پیاوێ ووتی ئەی پێغەمبەری خوا دەڵێی ئامۆژگاری کردنی ماڵ ئاوایی یە بەڵێنی چیمان پێ دەدەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئامۆژگاریتان پێ دەکەم بە لە خوا ترسان و

١) یونس/٣٢ ٢) الانعام/٣٦ ٣)النساء ٥٩ ٤)الانعام ١٥٣ ٥)متفق علیه ٦)تلبیس ابلیس

گوێ دان و فەرمانبەری کردن ئەگەر بۆ بەندەیەکی حەبەشیش بێ چونکە هەر کەسی لە دوای من بژی ناکۆکیەکی زۆر دەبینێ جا ئەست بە سوننەتی من و خەلیفەکانی ڕاشیدین بگرن و بەدان توند بیگرن و بشترسن لەو شتە تازە پەیدا

بووەکان، چونکە هەرشتێ تازە پەیدا بوبێ بیدعەیە وەهەر هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە (٧) ابراهیم کوری میسر فەرمووی رەحمەتی خوای لێ بێ لە عاشە ( رضی الله عنها ) ووتی پێغەمبەر

فەرمووی ﴿ من وقر صاحب بدعة فقد اعان على هدم الاسلام ﴾ واتە : هەر کەسێ ڕێزی بیدعە چی بگرێ ئەوە وەکو ئەوە وایە یارمەتی دابێ لەسەر وێران کردنی ئیسلام . بەڵێ بیدعە ووشە تازە پەیدا بووەکان لە دوایی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانی پەیدا بوون (بیدعة) چی‌یە ؟ (بیدعة) بریتی‌یە لە کردنی کردەوەیەك کە لە سەردەمی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی نەبووبێ دوایی خەڵك دایان هێنابێ .

وە ئەو بیدعانەی دەکرێ زۆر بەیان پێچەوانەو ڕووبەڕووی شەریعەت دەبنەوە ، بزانە کاتێ ئەبو بەکر و عومەر بە (زید بن ثابت) یان ووت قورئان کۆ بکەوە ، زەید پێ یانی ووت ئێوە چۆن کارێك ئەنجام دەدەن کە پێغەمبەری خوا نەی کردبێ لە (محمد بن ابی قاسم) لە (ابن البختری) یەوە پیاوێ هەواڵێ بە (عبد الله بن مسعود)دا کەوا کۆمەڵە کەسێك هەنە لە دوای نوێژی مەغریبێ لە مزگەوتێ دادەنیشن لە دوایدا پیاوێکیان دەڵێ ئەوەندە جار (الله اکبر) بکەن ئەوەندە جار (سبحان الله) بکەن ئەوەندە جار (الحمد لله) بکەن عبد الله ووتی ئەگەر ئەمجارە ئەوانەت دیت وایان دەکرد وەرە پێم بڵێ ، عبد الله چووە لایان دانیشت ، کاتێ گوێی لێ بوو عبدالله کوڕی مەسعود هەستا ، عبد الله پیاوێکی تیژ بوو ، ووتی ئەمن عبدالله ی کوڕی مەسعودم پێ دەڵێن سوێندم بەخوا بیدعەیەك و داهێناوە هەر مەپرسە چەند ستەمە چونکە ئێوە خۆتان بەزاناتر دەزانن لەهاوەڵەکانی موحەمەدی (ﷺ)جا ( عمرو بن عتبە) ووتی (استغفرالله) عبدالله ی ووتی مادام وەیە پێویستە واز بێنن و ڕێگەی ڕاست بگرنەبەرو لەئەستۆی بگرن .

(٧) الاذکار للنوی ص١٣٦

ئەگەر لەرێگەی ڕاست لادەن و بەلای ڕاستە یان چەپە دا بڕۆن ئەوە زۆر دوور گومرا دەبن . (١)(عمر بن عبد العزيز) وتی ئامۆژگاریتان دەکەم بەلە خوا ترسان ومیانە ڕەوی لەکاروبارەکانی خوای گەورەو پەیڕەو کردن لەسونەتی پێغەمبەر (ﷺ) و واز هێنان لەهەرچی ئەو شتانەی تازە پەیدا بوون پێشەوا (ابو حنيفة) (رحمه الله) فەرموویەتی ( لەسەرتا نەبەقسەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن و ڕێگەی سەلەف بگرنە بەر و وەلەهەرچی تازە پەیابووە بترسن چونکە هەر هەموویان بیدعەنە ) . هەروەها پێشەوا (مالك) (رحمه الله) فەرموویەتی ( هەر کەسێك لەئیسلام بیدعەیەك دابنێ وەبڵێ بیدعەیەکی باشە ( حسنة ) هیە ئەو کەسە پێی وایە (موحەمەد) خیانەتی لەئایندا کردوە چونکە خوای گەورە فەرمویەتی (اليوم اكملت لكم دينكم) واتە : ئەمڕۆ دینی ئێوەم تەواو کرد. نابێ لەو ڕۆژی ئاینێك هەبووبێ و ئەمڕۆش ئاینێکی تر هەبێ . وەپێشەوا (الشافعي) (رحمه الله)دوای ئەوەی کتێبەکەی دانا فەرمووی دەبێ لەم کتابەی من هەڵە هەبێ چونکە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ ولو كان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا ﴾ واتە : ئەگەر قورئان لەغەیری خواوە بوایە لەوا ئیختلافێ زۆریان ئەدی هەر چیتان دیت لەکتێبەکەم پێچەوانەی قورئان و سونەت بێ ئەوە ئەمن لەقسەکەی خۆم دەگەرێمەوە وەپێشەوا (احمد بن حنبل) (رحمه الله) فەرموویەتی ( بنچینەی سونەت لای ئێمە دەست گرتنە بەهەرچی هاوەڵەکانی پێغەمبەر ( ﷺ) لەسەری ڕۆیشتن و چاو لێکرنیانە واز هێنانە لەبیدعە کردن چونکە هەرچی بیدعە هەیە گومڕاییە . [1] (حذيفة بن يمان) ووتی هەرچی بەندایەتیەك هەیە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نەیان کردبێ ئێوەش مەیان کەن . وەبزانە سەرچاوەی ئەو بیدعانە کەدەکرێن چەند شتێکە :- یەکەم: فەرموودەی بێ هێز (الضعيف) دووەم :فەرموودەی هەڵبەستراو ( الموضوع ) سێیەم :- عادەت و وشتی خورافیات نابێتە بەڵگەی شەرعی دەبێ بزانی ئەو بیدعانە ترسناکی یان لەیەك ئاست

---

١) تلبيس ابليس

دانیه ، بەڵكو چەند پلەی هەیە . هەندێكی هاوبەش پەیدا كردن و كوفری ئاشكرایە هەندێكی ئاگاتە هاوبەش پەیدا كردن بەلام پێویستە بزاندرێ بچوكترین بیدعە كەپیاو لەئاینی دابینی دوای ڕوون بوونەوە حەرامە. حەرام بوونی بیدعە لەكردنی بیدعەكەنی‌یە ، وەكو هەندێ خەڵك وای تێ دەگەن وەبیدعە كردن تەنیا شتێكی ناپەسند (مكروه) نی‌یە . ئەگەر نا چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ ﴿ كل بدعة ضلاله وكل ضلاله فی النـار ﴾ یانی بابای خاوەن بیدعە گومڕایە وەگومڕاش جێگەی ناو ئاگرە ، بەڕاستی كارو كردەوەی بیدعە كردن زۆر ترسناكە كەچی زۆربەی خەڵك لێ بێ ئاگانەو نایزانن مەگەر كۆمەڵێك لەزانا هوشیارەكان نەبێ ، وەئەو بەڵگەیە بەسە لەسەر ترسناكی بیدعە كردن كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ ان الله احتجز التوبه عن كل صاحب بدعـه حتـی یـدع بدعتـه ﴾ [٣]واتە : خوای گەورە تۆبە لەخاوەن بیدعە قەدەغە دەكا هەتا واز لەبیدعەكردنەكەی دێنی ( سهل بن عبدالله التستری) ووتویەتی پێویستە لەسەرتان بەقسەی هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) و سونەتی پێغەمبەر بكەن ، بەلام دەترسم زەمانەك دابێ كەپیاوێك باسی پێغەمبەرو چاولێكردن لەكردەوەكانی بكا لەهەموو ڕوویەكەوەزەمی بكەن و لێی بڕەونەوە و بەخەی لێ هەڵ تەكێنن و زەلیلی بكەن وسوكایەتی پێ بكەن ( وەكو ئەو زەمانەی ) هەروا ( سهل) دەفەرموێ بیدعە كردن لەسەر دەستی‌ئەهلی سونەت ئاشكرا بوو ، چونكە ئەهی سونە ئاشكرایان كردو قسەیان لێ كردو قسە كانیان ئاشكرا كردو لەنێو خەڵكی بلاویان كردەوە ئەوەی نەشی بیستبوو گوێی لێبوو ، ئەگەر وازیان لێ بێنابایە و قسەیان لێ نەكردبایە ڕەنگە كەس نەی دەزانی و هەر كەسە لەسەر ئەو شێوە دەمرد كەلە دڵی دابوو هیچیان لێ ئاشكرا نەدەبوو لەگەڵ خۆی دەیبردە ناو گۆرەكەی . هەروا (سهل) دەفەرموێ هیچ كەستان باسی بیدعە كردن ناكا هەتـا

---

(٣)انیس المؤمنین ص٧٥

(٤) رواه الطبرانی والضیاء المقدس فی الاحادیث المختاره وغیرها بسند صحیح وحسن

شەیتان دێ بۆی باسی بەندایەتی یەك دەكاو پێی دەكا دوایی دێ بۆی باسی بیدعەیەك دەكا جا ئەگەر قسەی لەبیدعەكە كرد وەخەڵكی بۆ بانگ هێشتن كرا ئەوە ئەو بەندایەتیەی بۆ خوای كردبوو لێی ڕەش دەكرێتەوە . ( سەهل لەدرێژەی قسەكانی دەفەرمووێ هیچ فەرموودەیەك دەربارەی بیدعە چی‌یەكان لەو فەرمودەیە توندو تیژ تر نی‌یە . ﴿ حجب الله الجنة من صاحب البدعه ﴾ واتا خوا بەهەشتی قەدەغە كردووە لەبیدعە چی‌یان ﴿ الفضیل بن عیاض ﴾ وتویەتی ( هەر كەسێك پیاوی بیدعەچی خۆش بوێ خوای گەورە كردەوەكانی پوچەڵ دەكاتەوە ورۆناكی ئیسلامەتی لەدڵی دێنێتە دەرەوە . ( سفیان الثوری) وتویەتی بیدعە كردن لای شەیتانی لەگوناح كردن خۆشەویستترە ، چونكە گوناح كردن تۆبەی لێ دەكرێ بەڵام بیدعە كردن تۆبەی لێ ناكرێ . ( ابن عباس ) فەرمووی ئێوە تەماشای ئەو پیاوە بكەن كەئەهلی سونەتەو خەڵكی بۆ لای سونەت بانگ دەكاو قەدەغەی لەبیدعە كردن دەكا ( ابو عالیە) ووتویەتی لەسەرتان پێویستە وەكو هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) وابن پێش ئەوەی پەرتەوازەتان تێ بكەوێ ، ئەوەهاش لەسەر زانایان پێویستە بەخەڵكی رابگەیەنن بۆ خەڵكی ڕوون بكەنەوە كەچی حەلالەو چی حەرامە چونكە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ لتبیننه للناس ولاتكتمونه ﴾ [1] واتە : حەتمەن بۆ خەڵكی بەیان كەن و نەی شارنەوە هەروا فەرمویەتی ﴿ وان هذا صراطی مستقیما فاتبعوه ولاتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبیله ﴾ [2] لەپێشەوە كراوتە كوردی. ( عبدالله بن مسعود) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) خەتەكی ڕاستی بۆ ڕاكێشاین دوایی فەرمووی ئەمە ڕێگەی خوایە دوای چەند خەتۆكەكی لەلای چەپ و ڕاستەوە لێكردوە ، دوایی فەرمووی ئەو خەتۆكانە هەریەكێكیان شەیطانەكی لەسەرە خەڵكی بۆ لای بانگ دەكەن دوایی ئەم ئایەتەی سەرەوەی خوێندەوە ﴿ وان هذا ... ﴾ وەئیستا بۆ

(١) تفسیر القرطبی المجلدی ص١٣١

(٢)الآیە ١٥٣ سورة الانعام

خوێنەری خۆشەویست.هەندێك نمونەی ئەو بیدعانە دەینینەوە کەوا دەکەونە ناو چوار چێوەی خەتۆکەکان کەبەم هێلکاری یەی لای خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە .

١) گۆڕ پەرستەکان بەخەڵکی نەزان دەڵێن وەرن هەرچیو مەبەستە لەم گۆڕە داوا بکەن وەکومنداڵ بوون وشیفای نەخۆش دان وهەرچی پێویستی‌یە کتان هەیە ، گومانیان وایە ئەو گۆڕانە توانایان هەیە لەسەر سود گەیاندن و زیان لادان ، ئەو نەزانا نەداوای شتی وا لەو گۆڕانە دەکەن کەدەبێ بەندە داوای شتی وا هەر لەخوا داوا بکا خۆتوند دەکەن بۆ چوونە سەر ئەو گۆڕانەو و داوای شتی وایان لێ دەکەن ، وەکو چۆن نەفامەکان داوایان لەبتەکان دەکرد ﴿ فانا لله وانا الیه راجعون ﴾

٢) خاوەن پەڕۆکی سەوز دەڵێتە نەفامەکان ئەو پەڕۆکە سەوزەی لە دەستتان ببەستن و بەخۆتانی وەکەن دەرمانی هەموو دەردێکە وە هەموو بەڵایەکیش ڕزگار دەکا خێزانی عبدالله ی کوڕی مسعود وتی عبد الله هاتەوە داوەکەی دەستی دیتم ، وتی خانم ئەوە چی‌یە وتم ئەوە نوشتەیە بۆم کراوە وتی عبد الله داوەکەی دەستی پچڕاندم دوایی وتی ژن و منداڵی عبد الله بێ نیازن لەهاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا گوێم لەپێغەمبەری خوا بووە دەی فەرموو ﴿ ان فی الرقی والتمائم والتولە شرکا﴾ واتە : بێ گومان نوشتە و کلاون وکوژەکە و چەوری و شیرینی هاوبەش پەیدا کردنە

٣) ( بابە خەلیفە) دەڵێ مەدەد(یاپیر) هاوارە دەروێشەکان دوای دەکەون و دەست بەسەما کردنێ دەکەن و دەور بەری سەرمەست دەبن (باب خەلیفە) وانی‌یە خۆ (یاپیر) ناوەك نیە لەناوەکانی خوا ، وەداوای بەهانا وەهاتن لەمردوی گۆڕ هاوبەش پەیدا کردن و کوفری ئاشکرایە ، بەڵگەش فەرموودەی خوای گەورەیە .

﴿ ولاتدع من دون الله مالاينفعك ولايضرك فـان فعلت فـانك اذاً مـن الظـالمين ﴾[1]
واته : وەبێگجەلەخوا هاوار بۆ شتێ کەنەسودت پێ دەگەیەنێ ونەزیان مەبە جا ئەگەر ئەو کارە بکەی لەو کاتەدالەستەمکارانی .

٤) (کاکە دەرویش) شیرو زەرگی لەخۆی دەداو ئاگروشوشەی دەخوا وەتێ دەگا ئـەوە کەرامـەتی وەلیەکانەکـەچی نـازانی شـیر لـەخۆ دان و ئـاگر خـواردن سیفەتیخەڵکی جەمەندەمێیە ، لە (ابن کثیر) یـان پرسـیدەربارەی زوهـد وتـی زوهد دەست گرتنە بەسونەتوخۆ وەکو هاوەڵکانی پێغەمبەر ( ﷺ) لێکردنە .

ئەگەر ولز لەم کارە بهینیت و خۆە خەریك بکات بە فیر بوونی پیشەیەك سوودی لێوەگریت و سوود بە خەلك بگەینیت زۆر باشترە وەك ئەوەی ببیتە کارەبا لیزانیك ، ئاسنگەری دارتاشی ... هتد ، یان ببیتە ئەندازیاریك وولات ئـاوەدان بکاتـەوە یـان دوکتۆریـك چارەسـەری خـەلکی بکـات چونکـە بەشـیك لـەم دەرویشانە گەنج و منال و قوتـابین ، دیارە کە باشترین کەسیش ئەوەیە کە سـوودی بۆ خـەلك هـەبیت ( مەبەست لە دروست کردنی مرۆڤ نەزانی چاو لیکەری زو خۆبەگەورە زانین و یاخی بوون نی یە ئەوانە هەمووی رووشتی ئاژەڵ و درندەن مەبەست لـــە دروست کردنی مرۆڤ زانین دانـــــانی و مل کەچی یە ☒

٥) فتـوا دانـی بـەناو مـەلای نەزانـە ، فتـوا دەدا بـەبێدەلیل و خوێندنـەوەی تەفسیرەکان و فەرمودەراستەکان و بێ ئاگا لەشەریعەت ( علـی بـن ابیطـالب ) فـەرموی :. زەمانـەك بەسـەر خـەڵکی دادێخراپـترین خـەڵکی ئـەو زەمـانی مەلایـەکانن فتنـە لـەوان دەردەچـی و هـەر بـۆ وانیـش دەگەڕێتـەو یانیمـەلاکان زانانەو کەچی هەڵناستن بەو پێویستی یانەیدەیزانن . [2] (زیاد بـن جدیـر) وتـی عومـەر پـێی وتەدەزانـی ئیسلام بـەچی وێـران دەبـی وتم نـەخێر ، عومـەر وتـی

بە پی هەلخلیسکانی مەلاو دەمە دەم کردنی دووڕوان بە قورئان و پیشەوای گومراکەر(٣)

بەشێك لە شوبهەی گۆڕ پەرستان و وەلأم دانەوەیان خوای گەورە فەرموویەتی
﴿ ويعبدون من دون الله مالا يضرهم ولا ينفعـهم ويقولـون هـؤلاء شـفعاؤنا عنـد الله ﴾[1]
واتـە : وە بێجگـە لـە خوا گـەلێ شتی تـر دەپەرستن کە نـەزیانیان پـێ دەگـەێنێ نەسوودێکیان پێ ئەدەن ئەڵێن ئەمانـەن لای خـوا تکـا کارمـانن ، هاوبـەش پـەیدا کەرەکان ئەو بت و پەیکەرانـەیان لەسـەر شێوەی پێغەمبـەرو پیاوە گـەورەکانیان دروست کردبوو ، وەگومانیشمان وابوو هەر کات ئەوان خەریکی بەندایەتی ئەو

١) یونس /١٠٦ ٢) تفسير القرطبي ج١٢ص٢٨٠ ٣) رواه الدامي ٤) تفسير الكبير للأمام الرازي

پەیکەرانە بن ئەوە ئەو پیاوە گەورانە شەفاعەتیان بۆ دەکەن ، وە شێوەی ئەو بت پەرستیە لەو زەمانەش دا هەیە ، خەڵکێکی زۆر گۆری پیاوە چاکەکان بەگەورە دەزانن ، باوەڕیان پیان هەیە و وەتێ دەگەن ئەگەر گۆرەکانیان بە گەورە بزانن ئەوا گۆرەکان لەلای خوای گەورە شەفاعەتیان بۆ دەکەن . [1] لەبەر گۆرەکانیان دەپارێنەوە ، وە ئەگەر یەکێك پێیان بڵێ وەمەکەن ئەوە هاوبەش پەیدا کردنە لێی تورە دەبن و دەڵێن چۆن تۆ بە ئێمە دەڵێ هاوبەش پەیدا کەر ئێمەش وەکو تۆ شایەتی دەدەین و دەڵێن ( لا إلــه إلا الله محمد رسول الله ) و وە هەر خوا رسق دەرەو هە ر دەچینەوە لای خوا ، مەبەستی ئێمە هەر ئەوەیە ئەو پێغەمبەرانە و پیاو چاکانە شەفاعەت کارن و لەلای خوا شەفاعەتمان بۆ دەکەن چونکە ئێمە گوناحبارین و پیسین و هیچ نرخ و رێزێکمان لای خوانیە هەتا داوا لە خوا بکەین هەتا لە گوناحەکانمان خۆش بی‌و پێویستی یەکانمان بۆ جێ بەجێ بکا یازیانمان لێ لا بدا بۆیە ئێمە شەفاعەت بەوانە دەکەین و دەیانکەینە (وەساتە) لە نێوان خۆمان و خوامانددا چونکە ئێمە دەزانین پلەوپایەی ئەو زاتانە لای خوا چەند گەورەیە مەبەستیان پێ لەو زاتانە وەکو وەزیری لای پاشایانە . ئێمەش لە وەلامی ئەو نەزانانە دا دەڵێین یەکەم :- بەڕاستی بیرو باوەڕتان هەر هەمان بیرو باوەڕی هاوبەش پەیدا کەرەکانە کە خوای گەورە هەواڵی هاوبەشی پەیدا کەرەکانی بە ئێمە ڕاگەیاندوە فەرموویەتی ﴿ ويعبدون من دون الله مالا يضرهم ولا ينفعهم ويقولون هؤلاء شفعاؤنا عنــد الله ﴾ کراوەتە کوردی وەباوەڕی ئەو هاوبەش پەیداکەرانەش هەر وابوو کە دەیانگووت خوا بەدیهێنەرمانەو رسق دەرمانە بەڵام چونکە بتیان دەپەرست تا لە خوایان نزیك بکاتەوە و شەفاعەتیان بۆ بکەن بەڕاستی ئەو نەفامانە خوای گەورەیان هەروەکو (مرۆڤ) ئانابوو ، خوایان بە مرۆڤ چواند بوو یانی ( هاوبەش پەیدا کردن و پێك چواندنیان ) پێکەوە کۆ کردبۆوە نەیان دەزانی خوا قەت بە مرۆڤ پێوانە

(۱) یونس / ۱۸

ناكرێ ، ئایا خوا وەزیرو گزیرو پیشتیوانی هەیە هەتا بەندە ( تەوەسولی) یان پێ بکەن و لای خوا شەفاعەتیان بۆ بکەن ، بەڕاستی وەزیرو گزیر بۆ خوا ڕەوادان فەسادترین پێوانە و پیسترین شتە ، دەبی هیچ کەس هەبێ لەو کەسانە نەفام ترو کافر تر بێ ! [٣] خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وإذا سالك عبادی عنی فانی قریب اجیب دعوة الداع اذا دعان فلیستجیبوا لی ولیؤمنوا بی ﴾ واتە : وەکاتێ بەندەم لە بارەی منەوە لە تۆ پرسیار ئەکەن من نێزیکم پاڕانەوەی دوعا کەران لە کاتی بانگم بکەن وەڵام ئەدەمەوە جا ئەبێ ئەوانیش وەڵام بدەنەوەو بڕوام پێ بێنن جا خوا چ پێویستی بە ( وەساتە ) هەیە کە بفەرموێ ﴿ نحن أقرب اليه من حبل الورید ﴾ واتە : وە ئێمە لە ڕەگی گەردەنی بەو نێزیك ترین .

واسیتە بۆ ڕاگەیاندنی ئاینی خوا تەنها پێغەمبەرە بەرێزەکانن ( علیهم الصلاة و السلام ) بەڵام واسیتە بۆ لادانی زیان و سود بەخشین ئەوە بیرو باوەڕی هاوبەش پەیدا کەرەکانە چۆن دەبێ واسیتە هەبێ لە نێوان بەندە و خوا کە خوا بفەرموێ ﴿ ادعوني استجب لكم ﴾ واتا بانگم بکەن وەڵامتان دەدەمەوە خۆ خوای گەورە نەی فەرمووە بانگ لەوەلیەکانم پێغەمبەرکانم بکەن یان داوای بە هانا وەهاتن لە خۆشەویستان و پیاوە چاکەکانم بکەن بەڵکو فەرموویەتی بانگ لە من بکەن وەکو لە فەرموودەی خۆشەویست داهاتووە ﴿ من لم يسال الله يغضب عليه ﴾ واتە : هەر کەس لە خوا داوا نەکا خوا لێی تووڕە دەبی . خۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەیفەرمووە داوا لە پێغەمبەرەکان بکەن هەتا ئەوانیش بۆتان لە خوا داوا بکەن ، یا (تەوەسول) بە پێغەمبەران و پیاو چاکان بکەن . وە هاوبەش پەیدا کەران دەڵێن ئێمە شایستەی ئەوە نینە خەریکی بەندایەتی خوا بین مادام ئەوەیە ئێمە خەریکی بەندایەتی هەندێك لە بەندە نزیکەکانی خوا دەکەین وەکو فریشتەکان ، یـــــا پەیکەری فریشتەکان وێنەیان بۆ دروست دەکەین خەریکی بەندایەتی

(٢)التفسير الكبير

(٣) كتاب تطهير الجنان لاحمد بن الشافعي .

کردنیان دەبین لە سەر ئەم (تەئویل) کارییە . کەچی خوای گەورەش لەو لاوە بەڵگەی هێنانەوەتەوە لە سەر پڕو پوچی قسەکانیان لەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿ قل أدعوا الذين زعمتم من دونه فلا يملكون كشف الضر عنكم ولا تحويلا ﴾ [1] واتە : بڵێ گومانتان دەکرد کە غەیری خوا پەرستراوی تریش هەیە نەکۆسپێکیان پێ لا دەچێ و نەگۆڕانیان لە دەس دێ هەروا لە ئایەتێکی تر بەڵگەی قەدەغە کردنی داوای بەهانا وەهاتن لە غەیری خوای هێناوەتەوە و فەرموویەتی ﴿ لا تدع من دون الله مالا ينفعك ولا يضرك فان فعلت فانك اذا من الضالمين ﴾ واتە : بانگ مەکە بێجگە لە خوا نەسودت پێ دەگەێنێ نەزیانت لێ دەدا جا ئەگەر ئەو کارەت کرد ئەوا تۆ لە ستەمکارانی وە بەڵگەی قەدەغە کردنی داوای یارمەتی کردن لە غەیری خوا هێناوەتەوە و فەرموویەتی ﴿ اياك نعبد واياك نستعين ﴾ یانی خوایە بەندایەتی تایبەتە بە تۆوە بێجگە لە تۆ هیچ کەس ناپەرستین وە داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین لە کارو باری دین و دونیادا داوای یارمەتی لە هیچ کەس ناکەین بێجگە لە تۆ هەروەکو لەو فەرموودە دا هاتووە ﴿ اذا سالت فاسال الله و اذا استعنت فاستعن بالله ﴾ واتە : ئەگەر داوات کرد هەر لە خوا داوا بکە وە ئەگەر داوای یارمەتیت کرد هەر لە خوا داوا بکە . ئەگەر ئەو بیدعە چی یانە لەو ئایەت و شەرحی ئەو فەرموودانە تێ بفکریبانە دەیانزانی داوای بەهانای وەهاتن و داوای یارمەتی کردن لە غەیری خوا هاوبەشی پەیدا کردنە بۆ خوا و کوفری ئاشکرایە ئەو کەسەی داوای بەهاناوە هاتن لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات و بانگ لە غەیری خوا دەکا وەکو ئەوە وایە بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا لەو ناخۆشییە ڕزگارم بکە ، یا عبد القادر یان یا دسوقی یان یا رفاعی یان یا بدوی ، وەهیچ شك و گومانی تێدا نیە ئەو کەسەی داوای بەهانا وە هاتن لە غەیری خوا دەکا دێتە ناو بازنەی ئەم ئایەتە جا توخوا مرۆڤی ژیر چۆن داوای بەهاناوەهاتن دەکا کە ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە یا گوێی لێ دەبێ جـــا ئـەو

---

(١) الاسراء / ٥٦

ئەسەی رکوع یا سوجده دەبا بۆ مرۆڤی زیندوو یا مردوو یانەزر دەکا بۆ غەیری خوا وەکو ئەوە نەزری بۆ گۆڕی وەلی پیاو چاکان دەکەن یان لە دەورەی گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) یا وەلی‌یەکانی دەسورێنەوە یان داوای بە هاناوە هاتنیان لێ دەکەن لە ناخۆشی و .

دەڵێن یا رسول الله ئەو ناخۆشی‌یەم لێ لادە یا دەڵێ مەدەد عبد القادر یا دەڵێ یا گەیلانی یان داوای شتێك لە غەیری خوا دەکەن کە هیچ کەس توانای لە سەر کردنی نیە مەگەر خوا نەبێ بۆ نموونە داوای چا بوونەوەی نەخۆشی لێ دەکەن ، یا کوڕیان بداتێ یا ئەو شتانەی وونیان کردوە بۆیان بدۆزێتەوە ، یان ئەو ناخۆشی‌یەی بەسەریان هاتووە لە سەری یان لاباو وێنەی ئەو شتانە کە لە هێزو دەسەڵاتی مرۆڤ دانیە بیان کاتن ، جا بە کردنی هەر یەکێك لەو کارانە ئەو کەسە دەبێتە هاوبەش پەیداکەری گەورە بۆ خوای تاق و تەنیا ، کە خوا ئەت لێی خۆش نابێ مەگەر بە تۆبە کردن نەبێ هەروەکو فەرموویەتی ﴿ ان الله لا یغفر ان یشرك به ویغفر ما دون ذلك لمن یشاء ﴾ . واتە : بەڕاستی خوا لەوە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ وەگوناحانی تر خۆش ئەبێ بۆ هەر کەسێ بیەوێ . نەچەسپاو ، تەوەسول کردنی هەندێ پێغەمبەران بە هەندێکیان هەروەکو ئەمش چەسپاوە هاوەڵەکان تەوەسولیان بە پێغەمبەر (ﷺ) کردبێ چونکە تەوەسول کردن دوو جۆری هەیە ، جۆری دروست و جۆری نادروست ، ئەو جۆرەی دروستە ئەویش دەبێتە دوو جۆر ، جۆری یەکەم بریتی‌یە لە تەوەسول کردن بەباوەڕ بە خواو باوەڕ بە پێغەمبەرو بە کردەوە باشەکان ئەمەش کێشەی لەسەر نیە لە نێوان زاناکان نە لە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) وە نەلەدوا مردنی : جۆری دووەم : لە تەوەسول کردنی دروست تەوەسول کرنە بە دوعای پێغەمبەر(ﷺ) هەتا لە ژیاندا مابوو وەکو ئەو پیاوەی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێ کرد لە خوا داوای چاك بوونەوە بکا یا وەکو ئەو ئەعرابیەی داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد داوای باران بارین یان بۆ بکا ، ئەوە ئەو

تەوەسولەیە کەبە دوعای پێغەمبە (ﷺ) بوو بەڵام لەدوایمردنی ئەو تەوەسول کرنە نەماوبڕا. جا دروست نیە بابای موسلمان بچێتە سەر گۆری پێغەمبەر(ﷺ) و داوای پێویستی لێ بکا یاداوای لێخۆش بوونی گوناحەکانی لێبکا یا داوای زیان لادانی لێبکا بەڵگەش لەسەر هەندێ لەخەلافەتی عومەری کوری خەتاب باران نەدەباری عومەریش ویستی داوای باران بارین بکا چوودواوای لە عباسی کوری عبدالموتەلیب کرد دوعایان بۆ بکا بارانیان بۆ بباری جا فەرمووی ( ئەی خوایە ئەگەر باران نەباری یبایە ئێمە تەوەسولمان بە پێغەمبەرەکانمان دەکرد جا بارانمان بۆ دەباری بەڵام ئەمڕۆ تەوەسول بەمامی پێغەمبەر دەکەین ، پاشان ووتی ئەی عباس هەستە داوای باران بارینمان بۆ لە خوا بکە (١) . جا ئەگەر تەوسول لە دوایی مردنی پێغەمبەر (ﷺ) دروست بایە بە گۆرەکەی ئەوە هاوەڵەکانی لەچوونە سەر گۆری پێغەمبەر(ﷺ) لایان نەدەدا و نەدەچوونە لای عباس ، ئەوە شتێکی ڕوونەو لە کەس شاراوە نیە مەگەر وکراوە کەسێ رەگەز پەرستیو عینادی چاوی کوێر کردبێ چووبینە دوو رێگەی گومراو فەساد(٢)ووتراوە تەوەسول ( پاڕانەوە ) بیدعەیە کوفر نی یە بەڵکو کوفر داوای فریاکەوتنە( الاستغاثة) بە پێغەمبەر یان کەسیتر هەروەك چەند جارێ تر باس کراوە. هیچ فەرموودەی ڕاست (صحیح) یان چاك( حسن) نەهاتووە لەبابەت پاڕانەوە لە مردووان بەڵکو ئەوەی ووتراوە یان لاوازە ( ضعیف) یان دانراوە . مردووەکان نەگوێ یان لەهیچە ئەوەلامیش دەدەنەوە ،خوای گەورە دەفەرمووی( ان الله یسمع من یشاء وما انت بمسمع من في القبور ) پاکی بۆ ئەوخوایەی کە دڵ و دەروونی ئەو گۆر پەرستە دەجالە ڕێ لێ وون بوانەی کوێر کردووە کە زیندوو و مردوو وەك یەك دادەنێن هەتا ووتیان روحەکان دوایی جیا بوونەوەیان لە لاشە دەمێننەوە هەڵس و کەوتێکی تەواو دەکەن ، ئەمانە چەند نەزانن کافرن ئەگەر ئەم مردووانە ئەوها زیندوون نابوایە لە گۆر بنرێن و ماڵەکانیان دابەش بکرایە وژنەکانیان مێردیان ( شوویان) بکردایە ( بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ) ئەو حەدیسەی ( ترسلوا بجاهي پاڕانەوە بە خاتر من بکەن ) ( ابن القیم ) وتوویەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر سەردانی گۆری بکردبایە بۆ ئەوەی زیارەتی دەکرد دوعایان بۆ بکاو ڕەحمەتیان بۆ بنێرێو داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکا ، بەڵام هاوبەش پەیدا کەران سەر پێچیان کردوە لەو شێوە چوونە سەر گۆرەی پێغەمبەر (ﷺ) دەیکرد ، هاوبەش پەیدا کەران لە چوونە سەر تەنیا ئەوەیان هێشتۆتەوە کە دووعا لە مردووەکە بکەن و

سوێند لەسەر خوا بخۆن بە گۆڕی مردووەکە داوای پێویستی یان لێ دەکەن و داوای یارمەتیان لێ دەکەن و ڕوویان لێ دەکەن بە پێچەوانەی هیدایەتی پێغەمبەر (ﷺ) چونکە هیدایەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە چونە سەر گۆڕ یەکتا ناسی ( التوحید ) چاکە کردن بۆ مردووەکان بەڵام چونکە سەر گۆڕی ئەو هاوبەش پەیدا کەرانە خراپەکاری یە هەم بۆ خۆتان هەم بۆ مردووەکان دوعا کردن لەم شوێنە سێ جۆرە ، یان ئەوەتا دوعا بۆ مردوەکە دەکەی یا ئەوەتا دوعای لێ دەکەی یا ئەوتا دوعای لای دەکەی !، هاوبەش پەیاد کەرەکان دەڵێن دوعا کردن لەلای مردووی گۆڕ لە دوعا کردنی مزگەوت گەلێ باشترە ، وە هەرکەسێ بیربکاتەوە لە هیدایەتی چوننە سەر گۆڕی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی و لەگەڵ چوونە سەر گۆڕی هاوبەش پەیدا کەران ئەوا گەلێك لێك دوورە (١) .

## بەشێك لە ڕاست کردنی گۆڕ

لە ( ابي حياج الاسد ) ووتی عەلی ئەمنی نارد ووتی بۆ شتەت دەنێرم پێغەمبەر منی بۆ نارد بچم هەرچە گۆڕێکی بەرز هەیە ڕاستی بکەم لەگەڵ زەوی وە هەر پەیکەرێکیش هەیە وردو خاشی بکەم (٢) وە چەند بینایەی جوان هەیە لەسەر گۆڕان دروست کرایە کە مایەی فەسادیە ئیسلام بۆی دەگری‌لەوانە بیرو باوەری بابای نەفام بۆ خانوو سەقفی سەر گۆڕان وەکو بیروباوەر کافرەکان وایە بۆ بتەکانیان ، گومانە ئەو نەفامانەش ئەو هایە ئەو گۆڕانە دەتوانن سود بگەینن و زیان لابدەن ، گۆڕەکانیان کردۆتە جێگەی ڕازو مەبەست بۆ بە جێهێنانی پێویستی یەکانیان و کردویانەتە پەناگە بۆ سەرکەوتنی داواکانیان !، وە دوای شتی وا لە گۆڕەکان دەکەن کە بەند دەبێ شتی وا هەر لە خودا داوا بکا ، دەچنە سەر گۆڕەکان دەستیان پێ‌دادەهێنن و داوای بەهاناوەهاتن یان لێ‌دەکەن بەم جۆرە وازیان لە هیچ شتێك نەهێناوە کەلە سەردەمی خۆی هاوبەش پەیدا کەرە نەفامەکان بۆ بتەکان دەیانکرد ( فانا الله وانا اليه راجعون ) خەڵك ئەو هەموو شتە خراپە و پیسانە دەکەن بەڵام هێشتا نابینی نە مەلایەك نەفەقێ یەك نە ئەمیرەك نە وەزیرەك عیرەتی پارێزگار

١ ) رواه البخاري      ٢ ) كتب تطهير الجنان

٢ ) فقه السنة ص٥٦٦      ٤ ) قال المنذري الحديث اخرجه مسلم والترمذي والنسائي

ئاینەکەی بیگری‌و بێتە دەنگ وە زۆر جار وەیە فتنەم بۆ دەگێڕنەوە کە هیچ گومانی تێدا نیە زۆر لەو گۆڕ پەرستانە ئەگەر لەلایەن نەیارەکە سوێند بدرێ بەخوا ، ئەوە سوێند بە درۆ دەخوا ئەگەر بەسەری شێخەکەی‌بیخۆری یابەسەری فلانە وەلی کە باوەڕی پێ‌ی هەیە دەمی تێك دەئاڵێ و زمانی دەگیرێ و سوێند بەسەریان ناخواو دان بەهەقە کە دادەنێ ئەوە یەك لەو شتانەیکە بەڵگەیە لەسەر هاوبەش پەیدا کردنە کەیان بۆ خوای پاك و خاوێن ، کە گەیشتۆتە سەروەی هاوبەش پەیدا کردنی ئەو کەسانەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن خوا دووی دووەمانە یا سێ‌ی سێ‌یەمانە .

ئەی زانا موسڵمانەکان ئەی سەرۆکەکان چ گوناحێ لەئیسلام لەوکفرە گەورەترە ، وەچ بەلایەك بۆ ئەو ئاینە زیانی زیاترە لەبەندایەتی کردنی غەیری خوا ، وەچ گوناحێك هەیە موسڵمان توشی بێ وەکو ئەو موسیبەتە بێ ، وەپێویستە ئینکار بکرێ باشە ئەگەر ئینکاری ئەم هاوبەش پەیداکردنە ئاشکرایانە نەکرێ دەبێ ئەدی ئینکاری چی بکرێ .

(الحافظ ابن القيم)لە (زاد المعاد)لە (فضل قدوم وفود العرب) دەڵێ : حاڵی دیتنی ئەو خانوو قەفەسانەی لەسەر گۆڕەکان دروست کراون کەلەغەیری خوا بەندایەتیان بۆ دەکرێ‌و خاوەنەکانیان دەکەنە هاوبەشی خودا ڕەوانیە مانەوەیان لەئیسلامدا بەڵکو پێویستە وێران بکرێن ، وەدروست نیە پارەو پول و زەویان بۆ وەقف بکرێ پێشەوای موسلمانان بۆی هەیە وەقفەکان ببڕی بۆ سەربازی ئیسلام و بکرێتە یارمەتی بۆ بەرژەوەندی موسلمانان هەروەها هەرچی کەل و پەلی لێ هەیە بۆیان وەقف کراوە بۆ ئەو خانوو قەفەسانە بۆی هەیە وەری بگرێ و خەرجیان بکات لەبەرژەوەندی موسڵمانان هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) پارەو پولی ئەو تاغوتانەی زەمانی خۆی وەرگرت و لەبەرژەوەندی موسلمانان خەرجی کرد چونکە ئەمرۆ ئەو شتانەی بۆ خانوو قەفەسی سەر گۆڕەکان دەکرێ ئەم کاتیش هەر ئەو شتانەیان دەکرد وەکو ئەو شتانەی نەزریان دەکرد

بۆ خانوەکە یان قەفەسەکەو دەهاتە دەست ، وەچۆن یەکە لەگەڵ هاوبەش پەیداکردنی ئەو قەومەی ئێستا هاوبەش بۆ خوا دا دەنێن دەڵێن دمزانین خاوەن گۆرەکان عەردو عاسمانیان دروست نەکردوە بەڵکو هاوبەش پەیداکەرەکانی ئەهلی هاوبەش پەیداکەری پێشوە [1]. وەزاناکان فتوایان داوە بەوێران کردنی ئەو مزگەوت و گومبەتانەی کەلەسەر گۆرەکان دروست کراون (ابن حجر) لە (الزواجر) دەڵێ ( پێویستە دەست و برد بکرێ لەوێران کردنی ئەو مزگەوت و گومبەتانەی کەلەسەر گۆرەکان دروست کراون چونکە زیانیان لەمزگەوتی (ضرار) زیاترە بۆ سەرپێچی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) دروست کرا بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)قەدەغەی کردوەو فەرمانی بەوێران کردنی گۆری بەرز بۆوە لە زەوی کردوە ، پێویستە هەموو چراو فانۆسەکی تێدا لابرێ وەدروست نی‌یە شتیان بۆ وەقف و نەزر بکرێ [2] ، (ابو هریرة)وتی پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموی ﴿ قاتل الله اليهود اتخذوا قبور انبيائهم مساجد ﴾[3] ، واتە : ئەی خوا جولەکەکان بکوژی گۆری پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت .

بەشێك لەبیرو ڕادەربارەی ڕێبازی صۆفی‌یەتی لە ئیمام (ابو بكر الطرطوشي) پرسیار کرا ڕەحمەتی خوای لێ بێ شەرع زانی گەورەمان چی دەڵێ دەربارەی ڕێبازی صۆفیەتی ( خوا تەمەن درێژی بکا ) پرسیارەکەش ئەوەیە کۆمەڵێك پیاو کۆدەبنەوە زۆر زیکری خوای گەورە و پێغەمبەر ( ﷺ) دەکەن دوایی دەست لەشیر لەخۆدانێ دەکەن وەهەندێکیان هەڵدەستن سەمای دەکەن و سەرمەست دەبن ولەهۆش خۆدەچن دوایی شتی ئامادە دەکەن و دەخۆن ئایا چونە لای ئەو کەسانە دروستە یان نا فتوامان بۆ بدە خوا پاداشتت بداتەوە ڕەحمەتی خوات

(1) عون المعبود شرح سنن ابى داود ص(٣٦)ج٩ حديث ٣٢٠٢ وهذا الحديث مع شرحه مذكور فى تحفة الاحوذى من شرح جامع الترمذى ج٤ ص١٥١ الحديث رقم ١٠٥٤ .

(٢) فقة السنة

(٣)رواه البخارى و مسلم .

لێ بێ . وتی یاشێخ ئەو قسەی باسی دەکەن بۆ گوناحباریان بەسە پێش ئەوەی پەرتەی لێ بکەن ئەو هەڵخلیسکانەو وێنەی ئەمانە شێخ ووتی (مەزهەبی صۆفیەتی پڕەوپوچ (بطالة) و نەفامیەتیە(جهالة)و گومراویە لە (الضلالة)ئیسلام تەنیا قورئان و سونەتی پێغەمبەرە (ﷺ) سەماکردن و مە ست بوون یەکەم کەس کەدای هێنا هاوەڵەکانی سامیری بوون ، کاتێ سامیری گوێلەکەیەکی بۆ دروست کردن و قوڕەی لێوە دەهات هەڵستان لەدەوروبەری گوێلەکەکە دەستیان بەسەما کردنێ کرد ئەوە ئاینی کافرە گوێلەکە پەرستانە وەشیرو زەرگ لەخۆدان یەکەم کەس کە لەخۆیان دا زەندیقەکان بوون هەتا موسڵمانان بەخۆیانەوە خەریك بکەن و واز لەقورئان و سوننەت بێنن ، بەڵام تەماشا دەکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانی دادەنیشت دەتوت تەیر بەسەر سەریانەوە هێندە بەویقار دادەنیشتن جا پێویستە لەسەر سوڵتان و بریکارەکەی ئەو کەسانە قەدەغە بکەن لەهاتنە مزگەوت و جێگەی تر بۆ هیچ کەسێك ڕەوا نیە بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێ لەلای ئەو کەسانە دابنیشن یا یارمەتی یان بدەن لەسەر ئەو کارە پڕو پوچەیان ئەم وەڵامەش قسەی مەزهەبی مالك و و ابی حنیفەو شافیعی و احمد و پێشەوایەکانی تری موسڵمانانە ﴿ وبا لله التوفیق ﴾[1]

. خوای گەورە لەفەرموودەیەکی قودسی دەفەرموێ ﴿ عباد لی یلبسون للناس مسوك الضان وقلوبهم امَّر من الصَّبر والسنتهم احلی من العسل یختلون الناس بدینیهم ابی یغترون ام علی یجترؤن فبی اقسمت لا لبسنهم فتنة تذر الحلیم فیهم حیران )[2]

.واتە : من چەند بەندەیەکم هەیە لەپێستەی مەڕی دانەو دڵیشیان لەژەهری تاڵ ترەو وەزمانیشیان لەهەنگوینی شیرین ترە بەئاینەکەیان فێڵ لەخەڵکی دەکەن ئایا بەمن فریو دەخۆن یا جورئەت لەسەر من دەکەن سوێند بەخۆم دەخۆم فتنەیان وەکو کراسی لەبەر دەکەم پیاوی و نەرم نیان لێ سەر گەردان دەبی ئەو

(١) تفسیر القرطبی ــ سورة طه /٩٢

(٢) رواه ابن عاکر عن عائشة

فەرمودەیە ڕاست لەسەر ئەو کەسانە دەردەچی کەلەناو خەڵکی نەزان داوای وەلی یەتی یا خەلیفایەتی دەکەن وەبانگەشەی خەڵك دەکەن بەگەڵ کۆمەڵەکەیان بکەون ئەنجا هەڵدەستن زۆر بیدعەو خورافات یان بۆ جوان دەکەن ڕێگەی ڕاستیان لێ وێڵ دەکەن بەزمانەکی لەهەنگین شیرینترو بەدڵەکەی لەژەهر تاڵ ترئەوەی ئاشکرایە بەقسەی نەرم و نیان فێرفێڵ لەخەڵکی بەستەزمان دەکەن هەتا بۆ لای خۆیان ڕایان کێشن و ببنە خزمەتکاریان و بەقسەی هەستن و دانیشن. [٢] ( قتادة) دەڵێ سیفەتەکانی وەلی خوا ئەو سیفەتانەیە کەخوای گەورە لەقورئان باسی کردووە یانی لەترسی خوا پیستەیان گرژدەبێ و بەزیکری خوا دڵیان ئۆخژەن دەبێ ، نەیفەرمووە سیفەتی وەلیەکانم ئەوەیە لەهۆش خۆ دەچن و ئاوەزیان تێك دەچێ ئەو سیفەتانە سیفەتی بیدعەچیانەو لەشەیطانی وەیە لە ( عبد الله بن عروة بن الزبیر) ڕیوایەت کراوە وتی بەئەسمای کچی ئەبو بکری داپیرم ووت هاوەڵەکانی پێغەمبەر( ﷺ) حاڵەتیان چۆن بوو ئەگەر قورئانیان بەسەردا بخوێندرابایەوە ، چیان لێ دەهات ، ئەسما وتی بڵێم چیان لێدەهات وەکو خوای گەورە وەسفی کردونە دەگریان وەپێستەیان لەترسی خوا کرژ دەبوو ، عبد الله وتی بەئەسمام وت داپیرە ئەنا ئەمرۆ خەڵکانەك هەنە ئەگەر قورئانیان بەسەردا بخوێندرێتەوە لەهۆش خۆ دەچن اسماء ووتی ( اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) لە ( عبد الله بن عمر ) دەگێرنەوە بەلای پیاوەکی خەڵکی عێراق تێپەڕی دیتی واکابرا کەوتۆتەسەر عەردی وتی ئەو پیاوە بۆ وای لێهاتوە ، وتیان ئەو پیاوە ئەگەر گوێی لەقورئان خوێندن یازیکری خوا بێ وای لێ دێ ( ابن عمر) وتی ئێمە زیاتر لەخوا دەترسێن کەچی ناکەوینە سەرزوەی وە ( ابن عمر ) وتی دیارە شەیطان هاتۆتە ناو لاشەی ئەو پیاوە کردەوەی وەکو هاوەڵەکانی موحەمەدی نیە (ﷺ) لەلای (ابن سیرین)ی باسی ئەو کەسانە کرا کەقورئانیان لا بخوێندرێ لەهۆش خۆ دەچن، (سیرین)

(٤) الاتحاف السنیة بالاحادیث القدسیة حدیث رقم ١١٦ ص ١٤٥ - ١٤٦

وتی جیاوازی لەنێون ئێمە ئەواندا ئەوەیە ئەگەر یەکێکیان بچێ لەسەر پشتی بەیتی دانیشی پێی درێژبکا پاشان قورئان بخوێنێ لەسەرەتاوە هەتا دوایی ئەگەر پاشان خۆی فرێدایە خوارێ ئەوجا ڕاست دەکا .[1] لە (أحیاء علوم الدین) (ابو حامد الغزالی) باسێکی هێناوە دەڵێ ئێمە خەڵکەکی زۆر دەبینین خۆشی‌یەکی بێ تامیان لێ بەدەردەکەوی ئەویش کاتێ گوێیان لەچەند دێرە هۆنراوەیەك دەبێ کەباسی بەیەك گەشتینی یاردەکا یا باسی لێك دوور کەوتنەوە لەیەکتر دەکەن بەڵام کەگوێ یان لەقورئان دەبێ هەست بەهیچ خۆشیەك ناکەن ئەگەر پێ یانبڵێی چۆن ئێوە لەمانای قورئان خوێندن سەلامەت بوون و بەشیعریش کەیف خۆش دەبوون ئەوا لەچەند ڕوویەکەوە عوزرت بۆ دێننەوە . بەڵام من دەڵێم لەو مانایە بێبەش (محروم) دروست کراوم بەپێچەوانەی ئێوە من هەر چەند بیر لەنهێنیەکانی قورئان دەکەمەوە موچڕك بەلاشەم دادێ مووەکانم گرژ دەبن دڵم پڕ ترس و سام دەبێ ، بەڵام کەگوێم لەو دێرە هۆنراوانە دەبێ هەست بەهیچ خۆشیەك ناکەم و گۆشەگیر دەبم و هیچ شوێنەوارێکم لێ بەر ناکەوێ وەمن وادەزانم پرۆگرامی ڕاست و دروست هەر ئەوە یەکەلەچەند لایەکەوە ڕوونی بکەینەوە :. یەکەم : ئەو دێرە شیعرانە چەند وشەیەکن کەباسی بەیار گەیشتن و دورکەوتنەوە لەیار دەکەن و باسی تووڕەبون و خۆشەویستی دەکەن کەلایەقی خەڵکەو ئەم شتانە دەرحەق خوا کوفرە ـ وە خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وجلت قلوبهم ...﴾ ئەوە حاڵی خواناسانە لەهێزو سزای خوا دەترسن نەوەکو کردەوەی ئەو بیدعەچی‌یانەی هەر حەی حۆی و قیژەوزاك و زروکیانە جا ئەو کەسانەی ئەو حالە دەرونی یەیان لێ بەدەر دەکەوێ پێیان وایە ئەوە جۆرە خۆشی‌یەك و ترسانە لەخوا ، ئێمەش پێیان دەڵێن خۆ ئێوە حاڵ و نەگەیشتۆتە حاڵی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی لەخوا ناسین و وەلەخوا ترسان وە لەخوا بەگەورە زانین لەگەڵ ئەوەشدا لەکاتی ئامۆژگاری

(١) تفسیر الخازن لسورة الزمر ص

کردن حاڵیان هەروەك خۆیان وابوو لەخوا ناسی دەگەیشتن و دەگریان لەترسی خوا هەروەکو خوا وەصفی حاڵی خەڵکی خواناسی کردوە لەکاتی بیستنی ناوی خواو قورئان خوێندن چۆن بوون جا هەر کەسێك وانەبێ ئەوە لەسەر رێنمایی ورێگەی ئەوان نینە ، وەکو خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ واذا سمعوا ماانزل الى الرسول ترى اعينهم تفيض من الدمع مما عرفوا من الحق يقولون ربنا آمنا فاكتبنا مع الشاهدين ﴾[3] واتە : وەهەر کاتێ ببیستێ ئایەتێ بۆ پێغەمبەر (نازل کراوە ) دەبینی چاویان لەفرمێسك پڕ دەبێ چونکە هەقیان بۆ دەرکەوتووە دەڵێن پەروەردگارمان بڕوامان هێنا ناو مان لەگەڵ شایە دان بنووسە .

بەڵام ئەو کار و کردوە گران و ناخۆشە کەس نەکردەی سۆفیە نەفامەکان دایان هێناوە و دەیکەن و وەتێ دەگەین رێگەی خاوێن کردنەوی دڵ و دەرونیانە ، ئەوە نازانێ و تێ نەگەیشتنە لە ئەحکامی شەریعەت ، چونکە پێغەمبەر ( ﷺ) هیچ شتێکی بە جێ نەهێشتوو مەگەر ڕونی کردۆتەوە جانازانم ئەو کردوانەیان لە کۆی دیوەو لە کوێیان وەرگرتوە وهێناوە ( ابن عباس ) وتی پێغەمبەر ( ﷺ) کاتەکێ وتاری بۆ دەداین پیاوێکی دیت لە بەر ڕۆژێ ڕاوەستا بوو جا پرسیاری کرد ئەوە کێ یە وتیان ئەوە ( ابو اسرائيل ) ە نەزری کردوە لە بەر ڕۆژێ ڕاوەستێ و دانەنیشێ و نەچێتە بەر سێبەرێ و قسان نەکاو بەڕۆژو بێ و فەرمووی فەرمانی پێ بکەن با قسان بکاو دانیشی و بچێتە بەر سێبەرێ بەس ڕۆژووەکەی نەشکێنێ ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر هەندێ هەرشتێ مرۆڤ ئازاری پێ بگات لەو شتانەی بەڵگەی شەرعی قورئان و سونەتی لەسەر نەبێ وەکو بەپێ خواسی ڕۆیشتن و لە پێش ڕۆژ دانیشتن و ( چل ڕۆژ چونە خلوە ) ئەوانە هیچ گوێ ڕایەڵی خوا نینە و دروست نییە ، بەڵکو گوێ ڕایەڵی بۆ خوا ئەوەیە هەرچی خوا و پێغەمبەر فەرمانیان داوە بە کردنیان [1]

(٢) التفسير الكبير ــ سورة الزمر /٢٣

(٣) المائدة /٨٣

پیاوێ هاته لای ( الحسن البصری ) ووتی جیرانەکم هەیە ( الفالوذج ) ی ناخوا ( الحسن ) ووتی لەبەر چی پیاوەکە وتی دەڵێ پێم ناکرێ شوکرانەی خوای لەسەر بکەم حەسەن وتی ئەدی ئاوی سارد دەخواتەوە پیاوەکە ووتی بەڵێ حەسەن ووتی بەڕاستی جیرانەکەت نەفامە چونکە نیعمەتی ئاوی سارد لە (الفالوذج ) ی زیاترە دەڵێن هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿ یا ایها الذین آمنوا لاتحرموا طیبات ما احل الله لکم ولا تعتدوا إن الله لایحب المعتدین / (٣) ﴾ واتە ئەی کەسانێ بڕواتان هێناوە شتانی پاك کەخوا بۆی حەلال کردن لە خۆتانی حەرام مەکەن و لەڕادە تێمەپەڕن بەڕاستی خوا زیادە ڕەوی خۆش ناوێ .

ئەوە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ( ﷺ) وەکو ابو بکر و علی و ابن مسعود و عبدالله بن عمر و ابو ذر الغفاری و سالم خزمەت کاری حذیفة و مقداد و سلمان الفارسی و معقل بن مقرن ڕەزای خوا لەسەر هەموویان بێ لەماڵی ( مظعون ) لەسر ئەوە ڕێکەوتن گۆشت و چەوری نەخۆن نەچن بۆ لای خێزانەکانیان و بۆنی خۆش لە خۆنەدەن و جلکی دڕ لە بەرکەن و دونیا ڕەفز بکەنەوەو بەزەوی دابگەڕێن و ببنە راهیب و هەرامەی خۆیان ببڕن ، خوای گەورە ئەو ئایەتەی سەرەوەی ناردەخوارێ ، دوایی پێغەمبەر ( ﷺ) هات و سوپاس و سەنای خوای کرد و فەرمووی ئەوە بۆ چی کەسانێك هەنە قسەی واو وایان کردوە ، بەلام ئەمن نوێژان دەکەم و دەخۆم و دەخەوم دەخۆم و بەڕۆژو نابم و دەچمە لای خێزانەکانم و جاهەرکەسێ لەسونەتی من لابدا ئەوە لەمن نیە [٤].

وەخوای گەورە فەرمویەتی ( ولله الاسماء الحسنی فادعوه بها وذروا الذین یلحدون فی اسمائه سیجزون ماکانوا یعملون ) (٥) واتە : هەر بۆ خوایە جوانترینی ناوەکان

---

(١)عون المعبود شرح سنن ابی داود مجلد ٩ ص ١١٥

(٢) الفالوذج :جۆرە مەلوایەکە لە ئاردو هەنگوین دروست دەکرێ

(٣) المائدة / ٨٧

(٤)خرجە البخاری عن انس (٥) الاعراف /١٨٠

جابەوانە بانگی بکەن وەئەوانەی کەدەست ئەدەن لە ناوی خوا خۆلائەدەن واز
بان لێبێنن لە دوای ئەوان بەسزای کردەوە خۆیان ئەگەن ئەو ئایەتە دوو
مەسەلەی تێدایە یە کەمیان کە خوا دەفەرموێ ( یلحدون الاسماء ) یانی مەیل
بوون و تەرك کردنی مەبەست وەکو دەڵێن ( الحد الرجل فی الدین ) یانی ئەو
پیاوە مەیلی دینی کرد ، وە ( اللحد ) یانی کاتێ مەیلی کرد هەر وەکو
کردەوەی ئەو نەفامانەی دوعای دادەینن و دەلێن ناوی خوای تێدایە بێجگە لە
ناوەکانی خوا زکری دەکەن بێجگە لە وەی باسی کردەوەکانی بکەن لەو
شتانەی کە لایەقی خوا نی‌یە .
( ابن العربی ) گوتویەتی وریای ئەم دوعایانە بن کەستان دوعا نەکا مەگەر بەو
دوعایانەی کە لە قورئان و سەونەتی ڕاست داهاتونە هەر دوعایەکی تر هەیە
وازی لێ بینن هیچ یەکێکتان نەڵێ دوعایەکی واو وام هەڵبژاردوە بەڕاستی
چونکە هەر خوا پێغەمبەری هەلبژاردوە و بەو شتانە بۆ خەڵکی ناردوە .
وە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ واذا مسه الشر فذو دعاء العریض ﴾ واتە : هەر
کاتێ خراپەی پێ بگا زۆر هاوار دەکا . وتراوە یانی ئەوان ( هاوبەشی
پەیداکەرەکان ) بانگیان لە خوا دەکرد ڕزگاریان بکا لە لە ناو چون کاتێ
ڕزگاری دەکرد یەکێکیان دەیوت ئەگەر فلانە کەس نەبوایە رزگارمان نەدەبوو
دزەکە دەهاتە سەرمان و وێنەی ئەو شتانە ، جا ئەو کەسانەی نیعمەتی خوا
دەدەنە پاڵ فلان و پاراستنی خوا دەدەنە پاڵ سەگ دەلێم زۆر لە خەڵکە عەوام
و بەناو موسلمانەکانی ئەمڕۆ ئەو قسانە دەکەن ولا حول ولا قوة الا بالله العظیم
(١)
.

﴿عن ابی هریرة قال رسول الله صلى علیه وسلم یکون فی آخر الزمان دجالون
کذابون یاتونکم من الاحادیث بما لم تسمعون انتم ولا آباؤکم فایاکم وایاهم لایضلونکم
ولایفتنوکم ﴾ (٢)

واته : لە ئەبی هوریرە ووتی پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموی لە ئاخر زەمانی دەجالی درۆزن دێتە لاتان بەفەرموودەی وا لاتان نە خۆتان و نە باوکیشتان گوێی لێ نەبووە جاوریابن لەوان گومراتان نەکەن و توشی فیتنەتان نەکەن .

# بەشێك لە دەفە لێدان

( صفوان بن امية ) ووتی ئێمە لە گەڵ پێغەمبەری خوا بووین هات ووتی ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە ڕسقەکی خراپی بۆ داناوم چونکە ڕسقم بە دەف لێدان پەیدا دەکەم ڕێم بدێ گورانی بلێم بەلاّم قسەی خراپ ناکەم پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموی ڕێت نادەمێ چونکە گۆرانی وتن نە کەرامەتە و نە نعیمەتە بەلاّم تۆ کابرایەکی درۆزنی دوژمنی خوای چونکە خوا ڕسقەکی حەلاّلی دایە بەلاّم ئەتۆ بۆ خۆت ئەو ڕسقە حەرامەت هەڵبژاردوە کە خوا حەرامی کردوە لە شوێنی ئەو ڕسقەی کە خوا حەلاّلی کردوە ئەگەر من پێشم خستبایە چیم پێدەکردی هستە لەلام تۆبە بۆ خوا بکە بەلاّم تازە چی بلێم پاش هاتنت دەنا تێرو پڕم دارکاری دەکردی و سەرم دەتراشی دەم کردیە پەند لەناو کەس و کارت و دورم دەخستیەوە و ماڵەکەم حەلاڵ دەکردی ببێتە تالانی مەدینە جا عمرو هەڵسا هەر خوا دەیزانی چەند بەشەرمەزاری و زەلیلی ڕۆیی پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموی ئەوانە یاخی بوو ( العصات ) ن هەر کەسێ لەوانە بمرێ بەبێ تۆبە کردن ڕۆژی دوایی خوا حەشری دەکات بەڕووتی بەبێ جلك هەر چەند جارێ هەلسێتەوە دەکەوێتە سەر زەوی ( ٣ ) . دەقی ئیمامی شافعی لە پەرتوکی ( آداب القضاء ) لە سەر ئەوەیە

---

(١)تفسير القرطبي يوسف / ١٠٦

(٢) عون المعبود المجلد ٤ ص ٧٨

(٣) تلبيس ابليس ص ٢٣٤

ئەگەر پیاو بەردەوام گوێ بداتە گۆرانی شایەتی دانی لێ وەرناگیرێ و دادگەری بەتاڵ دەبێتەوە ( احمد بن حنبل) ووتی ئومێدم وایە دەف لێدانی بوکان وشتی وا هیچی تێدا نەبێ ( عامر بن سعد البجلی ) وتی لە (ثابت بن اسعد ) ی دەگەڕام کە بەشداری غەزای بەدری کردبوو لە ئاهەنگی بوك گواستنەوەیەك دیتمەوە کەدوو کچی گۆرانیان دەگوت وەدەفیان لێ دەدا ، گوتم ئەدی ئەتو لەدەغەی ئەو گۆرانی وتن و دەف لێدانەی ناکەی ؟ (ثابت) ووتی نەخێر پێغەمبەری خوا ڕوخسەتی ئەوەی داوین [1]. (المصنف) ڕەحمەتی خوای لێ بێ وتویەتی بزانە گوێ دانە گۆرانی دووشتان بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە یەکێکیان دڵ بێ ئاگادەکا لەزیکری خواو بیرکردنەوە لەگەورایەتی خوای پاك خاوێن هەڵستان بەخزمەت کردنی دووەم:. مەیلی لەزەتی دونیا دەکەی کەبانگی دەکا بۆ بەجێهێنانی هەموو حەزو ئارەزو بازی بەرهەستەکانی کەگەورەترینیان چونە لای ئافرەتی (نکاح) ە وەتەواویشی لەزەتی لەو شتانەیە کە بەدەستی دەکەوی وەرێگەش نیە بۆ گەیشتنە ئەو دەست کەوتانەی لەرێگەی حەلالەوە ، جالەبەر هەندێ گۆرانی و شتی وا پیاو هان دەدا زینا بکا جا لەنێوان گۆرانی و زینا هاوئاهەنگیەك لەنێوانیاندا هەیە وەکو چۆن گۆرانی لەزەتی رۆح و گیانە ئەوهاش زیانا گەورەترین لەزەتی نەفسی ئینسانە ، لەبەر هەندێ لەفەرمودە داهاتووە گۆرانی ووتن نوشتە کردنی زینایە .[2] لە (ربیع بنت معوذ) ڕەزای خوای لێبێ وتی پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لام ( لەبەیانی بوکنیم و لەسەر جێگەکەم دانیشت وەکو ئەو دانیشتنەی تۆ هەندێ کچۆڵەمان لابوو دەفیان لێ دەداو بەسەر شەهیدەکانی بەدریان دا هەڵ دەدا هەتا کچۆڵەکەیان ووتی پێغەمبەرێکمان لایە غەیبی دەزانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی نا ئەو قسەی مەکە پێشتر چیت دەوت هەر وابڵێ .[3] لەعائیشەی ڕەزای خوای لێ بێ ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ﴿اعلنوا هذا النكاح واجعلوه فــي المساجد واضربوا عليه بالدفوف﴾ واتە : ژن مارە کردن ئاشکرا بکەن وەلە مزگەوتی بگێرن وەدەفەی لەسەر لێبدەن ) ئەوە هەر بۆ

فەرمان دانە بەشتی چاك وەكو لە ووشەی ﴿ وجعلوه في لمساجد﴾ هاتووە یان بۆ ئاشكرا كردنە بۆ بەرەكەت لەمزگەوت كەدەفەی لەسەر لێدەن بەلام لەدەوری مزگەوت وەشەرع زانان دەڵێن مراد لەدەفەلێدان زرو پۆیەی پێوە نەبێ (حافظ) ووتویەتی ﴿واضربوا علیه بالدفوف﴾ دەبێتە بەڵگە لەسەر دەفە لێدان كەتەنها تایبەت نیە بەئافرەتان ، بەلام دەڵێین ئەو قسەیە بێ هێزە چونكە فەرمودەی بەهێزتر هەیە كەدەفە لێدان هەر بۆ ئافرەتان ڕێی پێ دراوە وپیاوان ناگرێتەوە لەبەر هەمە لایەنەی قەدەغەكردنی پیاوان خۆبەئافرەتان نەچوێنن دەڵێم گۆرانی ڕێ پێدراوە (المباح)لەئاهەنگی بوكان تایبەتە بەئافرەتان و پیاواننا گرێتەوە .[4]

ئەو دەفەلێدانەی هەندێك لەشێخەكانی یەمەن دەیكەن ناشیرینترین كردەوەكانیانە هەر خوا بەخۆی وەلی ئایینەكەی خۆیتی و پێغەمبەرەكەی سەر دەخا [5]. ئەو زكرە بەدەنگانەی دەكرێن و دەفی لێدەدەن ئەوە ڕاگەیاندنی پی تەواو دەبێ . گۆرانی ڕێ پێ دراو بەدەفە لەبووكان دروستە لەبەر فەرمودەكەی (ربیعی كضی معوذ) كەبەلگەیە لەسەری (الضحاك) ووتی گۆرانی دل تێك دەداو مایەی خەشمی خوایە ( ابو حنیفة ) توندترین پێشەوایە لەبارەی گۆرانی وتنەوە لەهەموو مەزهەبەكان توندترە وەهاوەڵەكانی وتویانە حەرامە گوێ گرتن لەهەموو شتەكی پرو پوچ وەكو زورناو دەفە لێدان وپەنجە لێكدان فاسقایەتیەو

---

(١) تلبيس ابليس ص ٢٢٤

(٢) المصدر السابق ص ٢٢٢

(٣) رواه البخاري وابو داود و الترمذي

(٤) كتاب تحفة الاحوزي المجلد الرابع ص ٣١٠

(٥) كتاب تحفة الاحوزي المجلد العاشر ص ١٧٩

(٦) المصدر السابق مجلد ٤ ص ٢٠٥

امایەتی دانیان لێ وەر ناگیرێ بەلام شافیعی لەپەڕاوی ( القضاء) دەڵێ گۆرانی
ولن ناپەسند (مکروه)ە چونکە بەشتی پروپوچ دەچی بەلام (امام احمد) عبدالله
یکوڕی دەڵێ پرسیارم لەبابم کرد دەربارەی گۆرانی وتن بابم وتی گۆرانی دوو
رویی لەدڵ دەڕوێنێ پێی سەر سەرسام نیمە لەدوایی باسی قسەی (مالك) کرد
وتی (مالك) وتویەتی فاسقەکانی لای خۆمان گۆرانی دەڵێن .[1] بەلام ئەوەی
ئەمڕۆ صۆفیەکان دایان هێناوە کەبەردەوام گوێ دەدەنە گۆرانی وتن بەدو
رەلەوتارو مۆسیقاو کەمانچە ئەوە هەر هەموی حەرامە .[2] کەواتە : دروستە
دافرەت لەئاهەنگی بووك گواستنەوە و ژن مارەکردن و جەژنەکان دەفەی لێدەن
بەبەڵگەی ئەو فەرمودانەی لەپێشەوە باسمان کرد لەو بەشە بەلام بۆ پیاوان
لەمزگەوتان یاساغە هەندێ نەفام هەنە دەفە لێدان لەمزگەوتان بەئاین دەزانن
ئەگەر دەفەکەش شکا یا دڕا دەڵێن دەفەکە شەهید بوو ئەوجا تەماشایان کەئەو
پێستە پیسەی دێتە ڕیزی شەهیدە بەرێزەکان .

# بەشێك لەتازیە دانان

ئیمامی شافعی و هاوەڵەکانی ڕەحمەتی خوایان لێبێ دەڵێن دانیشتنی تازیەی
ناپەسند (مکروه) ە بەو جۆرەی کەس و کاری مردووەکە لە ماڵی دانیشن
وەمەبەستیان پێ ئەوە بێ خەڵك بێنە لایان ، بەڵکو پێویستە کەس و کاری
مردوەکە بڵاوەی لێ بکەن وەهەر کەسە بچێتە دوای کاری خۆی وەهیچ جیاوازی
بەکیش نیە لە تازیە دانیشتن لەنێوان ژن و پیاو . وە (المحاملی) یش لەشافیعی
وەرگرتوەو وتویەتی ناپەسندە لەتازیە دانیشتن وە ئەو ناپەسندیەش (کراهیة
التنزیه) ئەگەر شتەکی تازە پەیدا بووی لەگەڵ دا نەبێ بەلام ئەگەر بیدعەیەکی
تری حەرامی لەگەڵ دابوو وەکو ئەو عادەتانەی ئەمڕۆ باوە ئەوە حەرامە ،
چونکە شتی تازە پەیدا بوو لەفەرمودەی ڕاست داهاتووە ﴿ کل محدثة بدعة وکل
بدعة ضلالة وکلّ ضلالة فی النار﴾[3] واتە : هەرچی شتی تازە پەیدا بوو هەیە

بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییەوە وەهەموو گومڕایەکیش لەناو ئاگ
دایە . وە (حەنەفیە) پێشوەکان بیرو ڕایان وایە تازەیەدانان تا سێ ڕۆژان هیچ
تێدا نیە ئەگەر لەمزگەوت نەبێو توشی گوناح کردن نەبن ، بەلام ئەمڕۆ خەلکی
دەیکەن وەکو لەتازیەکۆبونەوە . وخێمە هەلدان و مافور ڕاخستن و پارەیەکی
زۆر خەرج دەکەن بۆ ناو دەنگ و شانازی بەخۆ وەکردن و کەیف بەخۆوە هاتن
ئەوانە هەمووی کارو کردەوەی تازە پەیدا بوو بیدعەنە پێویستە بەزووترین
کات موسلمانان لێی دورکەونەوە چونکە حەرامن نەخوازەلا ئەو شتانەی تێدا
ڕوو دەدەن کەپێچەوانەی ڕێنمایی قورئان و هەلوەشانەوەی فێر بونی سونەتە
لەسەر عادەتی نەفامی دەکرێ بۆ نمونە وەکو گۆرانی بەقورئان وتن و لەئەستۆ
نەگرتنی ئادابی قورئان خوێندن و گوێ نەدانی و خۆخەریك کردن بەجغارە
خواردن و شتی تره[1] بەلێ حەرامە تازیە دانان لەمزگەوت و جغارەی تێدا
بخورێ لەکاتی قورئان خوێندن ، هەروا حەرامە بەلاشە یابەجلك پیس
لەمزگەوت مانەوە . ئەی برایان ئەمڕۆ خەلکانەك هەنە مەندیلی سپی یاکلا
شیدەی زەردیان لەسەرە یان پێشدێنی سەوزیان لەپشتەو تەزبیحەکی (۱۰۱)
سەدو یەك دانەیان لەدەستەو خۆیان بەپلی دا دەوەشێنن دەلێ( کۆنە ئاغاو
کوێخانە ) شوێنی دانیشتنیان دیارە دەچنە ناو مزگەوت بەبێ کردنی سونەتی
مزگەوت ( تحیة المسجد) دادەنیشن لەگەل ئەوەشدا نوێژی سلاوی مزگەوت لای
هەندێ پێشەوایەکان کردنی پێویستە ، نەمەلا نە حاجی نەسەید فەرمان نادەن
بەکردنی نوێژی (تحیة المسجد)جا هەر جارەی کۆمەلە کەسێك یایەکێك دێ (
مەلا مەندیل سپی) دەلێ ( الفاتحة) بەلام مەلا جارێك نالێ کاکە ( تحیة المسجد)
بکەن

(١) عون المعبود مجلد ١٣ حديث (٤٩٠٦)

(٢)تفسير القرطبي مجلد(١٤) ص٥٤

(٣)كتاب الاذكار للندوى ص١٣٦

هەپێویستە یاسوونەتە لەگەڵ ئەوەشدا هەدیەکردنی ( فاتحة) لەتازیان بیدعەیە چونکە فاتیحە لەزەمانی پێغەمبەر (ﷺ) و سەحابەکان و وتابیعنەکان نەخوێندرایە کەچی (تحیة المسجد) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بەکردنی داوە (ڕەنگە هەندێ شڕە مەلا و کوڵکە مەلا نارەحەت بن بەڵام با ئاوێ سارد بخۆنەوە ((تحیة المسجد)) لای هەندێ زاناکان کردنی پێویستە هەروەکو لەپەرتوکی (أحمد العین)داهاتوە وەلای هەندێ زانای ترسونەتەکی دڵنیا کەرەوەیە ( المؤکدة )( ابی قتادة ) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿اذا دخل احدکم المسجد فلا یجلس حتی یصلی رکعتین ﴾ .[1] واتە : (ئەگەر یەکێکتان چوونە ناو مزگەوت بادانەنیشی هەتا دوورکات نوێژ دەکا .پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە لەمزگەوت دانیشی مەگەر دوای کردنی دوو ڕکات نوێژ ئەویش سونەتی (تحیة المسجد) ە بەگوێرەی فەرمودەکە نوێژی (تحیة المسجد) پێویستە[2] ،جائەی برای موسڵمان بیربکەوە چەند فەرمانمان پێ دەکرێ بیدعە بکەین بەڵام قەت جارێك فەرمانمان پێ ناکرێ پێویستی یەك بە جێ بێنن یاسونەتەکی بکەین . (عەلی کوڕی ئەبو طالب) : فەرموویەتی : زەمانەك بەسەر خەڵکی دادێ خراپترین کەسی ئەوزەمانی مەلایە بێ ئاگایەکانن فیتنە لەوان دەردەچێ‌و دوایش هەر بۆ وان دەگەڕیتەوە .[3] ئەی برای موسلمان ئەی حاجی کەشیدە زەرد لسەر رایەخی مزگەوتێ دادەنیشێ ئەگەر کۆمەلە کەسیك بینە تازیەی دەلێ‌ی برۆ جغارەیان بدەنێ وەبەدیمەن مەلای بێ ئاگا (ابو الدنیا)/قورئان دەخوینی‌و فیتو هۆری جغارە خواردنیتی کەچی لە (تحفة العرضیة) داهاتووە جغارە خواردن لەکۆری قورئان خویندن و زانست حەرامە ، وەمەلا قورئان خوین هیچ پاداشتی نیە لەسەر قورئان خویندنەکەی بەلکو هەر گوناحبارە خۆ زۆری لێ نەکرایە خوا ریسوای دەکاو یارمەتی نادا ، وەمەلاو دانیشتوەکان و خاوەن تازیە هەر هەموویان گوناحبارن بەڵام خاوەن تازیەکە لەهەموان گوناحبارترە وەرۆژی

---

(١) متفق علیه

قیامەتێ پەشیمان دەبێتەوە حەسرەت هەلدەکێشی  چونکە گەمەیان بەکەلامی خوا کردوە وەقەدەغەی ئەم گوناحە گەورەیان نەکردووە .[4]ئەی پشدێن کەسکی بەناو (سەید) بۆ بەو کەسانەی بەجلکی پیس دێنە مزگەوت دادەنیشن  یان خۆیان بەناو پاك ناکەنەوە نالێی بەو جلکە پیسەیان و بەو لاشە پیسەی لەمزگەوت دادەنیشتێ حەرامە هەروەکو لە پەرتوکی ( بغية المسترشد) داهاتوە ص[٧٢] ، ئەی مەلاکان بۆبە خەڵکی نالێن قسە کردن لەمزگەوت چاکەکانت  دەخوا چۆن مەرگیا دەخوا (صاحب الكشاف) وەری گرتوە کەلەفەرمودە داهاتووە مزگەوت بەخۆی و ئەو خەڵکەی تێی دایە بەرز  دەبێتەوە ئاسمان – لەلای خوا شکایەت دەکا لەسەر ئەو قسە دونیایی یانەی تێی دادەکرێ .[5] ئەو بەڵگانە بۆمان روون دەکەنەوە کەخەڵکی دەچنە مزگەوتێ و لەتازیەی دادەنیشن ئەوە لەبەر فەرمانی خواو گوێ رایەڵی خوا نیە کەدەچن وەنەلەبەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)  وەنەلەبەر شەریعەتە بەڵکونەوە لەبەر بیدعە کردنەکی خراپ و لەبەر سومعەو ریابازییە . لە (الفضیل بن عیاض)  دەگێرنەوە ووتی واز لەهەر کارەکی بینن لەبەر خەڵکی ریایە وەکردەوەش لەبەر خەڵکی هاوبەش پەیداکردنە [1]، وەکو نوێژی ( تحية المسجد) کردەوەیەکە واز لێ هێنانی لەبەر خەڵکی تازیەی ریایەو دانیشتنی لەمزگەوت لەبەر خەڵکی تازیەی ریایە ، ریاش هاوبەش پەیدا کردنی بچوکە ، چونکە بەدڵسۆزی بۆ خوا نیە هەندێ کەس هەنە دەڵێن ئێمە دەچین لەلای خەڵکی تازیەی دادەنیشین لەمزگەوتێ بۆ (مواراة) کەچی نازانی پێناسەی (مواراة) یش بکەن ، بەڵکو دانیشتێ لەلای خەڵکی تازیەی (مداهنة)یە (قرطبی)وتویەتی ئەو قسەی رێی غەیبەت داوە ئەوا

(٢)سبل السلام شرح البلوغ المرام الجلد ١ ، ص[١٥٨]

(٣)تفسير القرطبي المجلد ١٣ ص[٢٨٠]

(٤)كتاب تحفة المرضية

(٥)تفسير القرطبي المجلد ١٢ ص[٢٧٨]

بەئاشكرا فاسقەكان كاری خراپ دەكەن وەلەگەڵ جائیز بوونی (مداراة) یان هەتا خۆی لەشەڕی وان بپارێزێ ، بەڵام ئاگاتە (مداهنـــة)لـەئاینی خـوا وەجیـاوازی لەنێوان ووشەی (مــداراة)و (المداهنـة) دادەنیـە ووشـەی (مـداراة) یـانی بەخشینی دونیـا بـۆ چاكردنی دونیـاو دیـن وەیـان هـەردوكیان پێكـەوە ئـەوە ڕێ پـێ دراوە (مباحـة)وەجاروەشـە شتەكی باشیشـە . وە ووشـەی (المداهنــــة)یـانی واز لـەدین هێنـان بـۆ چـاكردنی دونیـا .[٢]جـا كەواتـە : ڕوون بـۆوە دانیشـتن لەتازیـەی مزگەوتێ (مداهنـة) یـە نـەك (مـداراة) جا تازیـە كردنیش خۆ لـەخۆیدا یـەك جـار چونـی دروستـە هـەروەكو لەفەرموودەی تازیـەی داهـاتووە .[٣]دەڵێـن دانیشـتنی تازیەی لەمزگەوتێ كارێكی پێویستە لەبەر ئەوەی جێگەی لەمزگەوتێ گـەورەتر نیـە یـا دەڵێـن تازیـە دانـان لەمزگـەوتێ عادەتـەكی كۆنـی بـاب و باپیرانمانـە لەمنیش دەڵێم (ئاخر) بەخۆتان و باب و باپیراتان لەگومڕایەكی ئاشكرادانە ئەو فتوا دانا نەمەر هـەمووی بیدعەیـەو گومڕایـی یـە هۆیـەكەشی بـۆ نـەزانی ووبـێ ئاگایی دەگەڕێتەوە ، (مالك بـن هبـيرة ) ووتـی پێغـەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی ﴿مـامن ميت يموت فيصلي عليه ثـلاث صفـوف مـن المسلمين الاوجـب الله الجنـة﴾ واتـە : هـەر كەسێ بمری و موسلمانان بە سێ ڕێز نوێژی لەسەر بكەن مەگەر پێویستە خوا بیباتە بەهەشتێ . (مالك) ووتـی ئەگەر خەڵكی سەر (جنـازة)كەم بوان دەیكردنـە سـێ ڕیـز ، ئـەوە ئامـاژەیـە بـۆ نوێـژی جـەنازە كەبەتەنـها ناپەسـندە . ئـەو فەرمودەیەبەڵگەیـە لەسـەر هـەندێ كەسـێ بمـری و سـێ ڕیـزە موسـڵمان نوێـژی لەسەر بكەن ئەوە خوا لێی خۆش دەبی وەكەمترین ڕیز دوو پیـاوە وەیـەك بـۆ زۆرییە . ئەی برایان بزانن ئەو نیعمەتە گەورەو ڕێكە ڕاستەتان بەهەمووجۆرە

(١)الاذكار النووی ص[٧]

(٢)عون المعبود شرح سنن ابی داود مجلد ١٣ص[١٤٨]

(٣)التاج ص[٣٨٠]

بیدعەیـەکی زەم کـراو گوریتـەوە لەوانـە بـۆ نمونـە وەکـو مـەلا بـێ ئاگـ
مزگەوتەکانیان کردۆتە شوێنی تازیەو بۆنەکان ( بانی مزگەوت بەکرێ دەدەن
کەچی قەدەغەیە مزگەوت بۆ شتی وا دروسـت بکـرێ ، دەبـی ئـەو فـەرمودەی
(معاویة)یان نەدیتبی کەپێغەمبەر (ﷺ) پێی فـەرموو ﴿ إن هـذه المسـاجد لايصلح
فيها شئ مـن كـلام الدنيـا انمـا هـو للتسـبيح والتكبـير وقـرآة القـرآن ﴾ واتـە : ئە
مزگەوتانە ناگونجێ هیچ قسـەیەکی دونیایی یان تێدا بکرێ چونکە مزگـەو
جێگەی سبحان الله والله اكبر کردن و قورئان خوێندنە . (حذيفـة) وتـی پێغەمبە
(ﷺ) فەرمووی ﴿ان الله اوحى إلي يا اخا المنذرين يا اخـا المرسـلين انـذر قومـك ا
يدخلوا بيتا في بيوتي الا بقلوب سليمة والسنة الصادقة وايد النقيـة وخـروج طـاهرة وا
يدخلوا بيتا من بيوتي مادام لاحد عند حظهم فاني العنه مادام قائما بين يدى حتى يـر
تلك الظلامة إلى اهلها فاكون سمعه الـذى يسمع بـه وبصـره الـذى يبصـره ويكـون مـ
اوليائي ويكون جاري مع النبيين والصديقين والشهداء والصـالحين ﴾ [٤]. واتـە : خـوا
گەورە وەحـی بـۆ نـاردم فـەرمووی ئـەی بـرای ترسـێنەران وەبـرای پێغەمبـەرا
قەومەکـەت بترسـێنە نەچنـە یـەکێك لەمالـەکانم مەگـەر بـەدلێکی سـاغەوە
بەسونەتێکی راستەوە ، بەراستیکی خاوێنـەوە ، بەدامەنـەکی پاکەوە ، بانەچن
یەکێك لەمالەکانی من مادام یـەکێکیان مـافێکی بەسـەر وەیـە ن ئـەمن نـەفرینی ا
دەکەم مادام لەبەر دەستم راوەستایە هەتا مافەکەی سەری دەداتەوە خاوەنەکەی
، ئەو کاتە دەبمە ئەو گوێ یەی کە گوێی پێ لەشت دەبی دەبمـە ئەو چاوەی
کەشتی پێ دەبینـی ئەو کەسـە دەبێتـە وەلی مـن دەبێتـە هاوسـێی مـن لەگـە
پێغەمبەران و راست گۆیان و شەهیدان و پیا و چاکان دەبێ . تازیە لەمزگەو
دانـان عـادەتی خەلکی عەوامە نەفامەکانە ئەوانیش چاویـان لەکۆلکـە مـەلا بـە
ئاگایەکان کردوەو کردویانەتە رێگەیەکی راست و دەلێن بەشێکە لەئاین کەچی
قریشی بەسەردینە وەنی‌یە بەلکو لەفریودانی شەیتانی نەفرەت لێکراوە جـــا

---

(٤)تفسير القرطبي سورة البقرة الآية ١٢٥ ، ص١١٥

پەوبستە هەر کەسێ ئاوەزی ساغی هەبی دینی راستی هەبی ئینکاری ئەو بدعانە بکاو خۆی لێ دوور بخاتەوە هەر چۆنێ بۆی دەکرێ ، ئەی مەلای مزگەوتان لەمزگەوتێ لەگەلیان لەتازیەی دامەنیشە ، چونکە گوناحبار دەبی ، دەبێ سی و دوو خواردن و خواردنەوەیان لەگەلْ مەخۆ بیر لەفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوە ﴿ سیکون فی آخر الزمان رجال یاتون المساجد فیقعدون فیها حلقا حلقا ذکرهم الدنیا وحبها فلا تجالسهم فلیس الله حاجه ﴾[1] واتە : لەئاخر زەمان پیاوانێك پەیدا دەبن دینە مزگەوت هەلقە هەلقە لەناوی دادەنیشن زکری دونیا دەکەن و دونیایان خۆش دەوێ لەگەلْ ئەو کەسانە دامەنیشە خوا هیچ پێویستی بەو کەسانە نیە .

## ﴿ ئاگاداریەك ﴾

ئیستا زۆربەی مەلای مزگەوتەکان مەعاشی مەلایەتی وەردەگرن ، جار وەیە مەلا دەچیتە سەفەرێ یا دەچیتە تازیەی یا دەچیتە بازرگانی یا هەر کاریکی تر مزگەوتی بەبێ مەلا بەجێ دیلی ، ئایا ئەو مەعاشە حەرامە یان ، حەلالە ؟! وتویانە هەر کەسی مەلای مزگەوتێ بی لەسەری پێویستە نوێژی لەمزگەوتێ بکا ئەگەر بەتەنیا بی و کەسیشی لەگەلْ نەبی ، یان جار وەیە مەلا دەچیتە تازیەی لەمزگەوتیکی چەند رۆژان لەلای خەلکی تازیەی دەمینیتەوە خۆی و مزگەوتەکەش وەکو خۆی پەك دەخا ئەگەر پێی بلێی ماموستاپەکی مزگەوتەکەت کەوتوە ، دەلێ بابە ئەمن ١چویمە تازیەی قورئانی دەخوینم بۆ مردوو ، ئەوە شایەنی باسە مەلا خۆی بە شافیعی مەزهەب دەزانی و لە مەزهەبی ئیمامی شافعی پاداشتی قورئان خویندن بەمردوی ناگا هەروەکو ئیمامی نەوەوی وتویەتی ئەو کەسانەی دەلین پاداشتی قورئـــــان خویندنێ

(١)التفسیر القرطبی ص٢٢٧ مجلد١٢

بەمردوی دەگا هەل و مەرجیان داناوە دەلین نابی لەسەر قورئانخویندنەکەی پارەی وەربگری ، ئەگەر مەلا بەکریێ گیراو پارەی وەرگرت لەسەر قورئان خویندنەکەی لەسەر پارە دەریو پارە وەرگری حەرامە وەمەلایەکەش یەك قلل خیری ناگاتێ لەسەر قورئان خویندنەکەی وەکو لەفەرمودە داهاتوە (احمد والطبرانی والبیهقی) لە(عبد الرحمن بن شبل) یان گیراوەتەوە ﴿ اقرؤا القرآن واعملوا به ولاتجفوا عنة ولا تغضلوا فيه ولاتستكثروا به ﴾[2].واتە : (کارو کردەوە بەقورئان بکەن و جەفای مەدەن و لێی بێئاگا مەبن وەپارەی پێپەیدامەکەن ) (ولید بن قیس)گوێی لە (ابا سعید الخدری)بوو دیوت گویم لەپیغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو ﴿ يكون خلق القرآن لايعدوا تراقهم ويقرأ القرآن ثلاثة مؤمن ومنافق وفاجر وقال بشير سالت الوليد ماهؤلاء الثلاثة قال المؤمن مؤمن به والمنافق كافر به والفاجر ياكل به ﴾[3]. واتە : خەلکانەك پەیدا دەبن قورئانی دەخوینن لەقورگیان تێناپەری سێ کەس قورئانی دەخوینن بروا دارو دوو روو پیاو خراپ (بشیر) وتی لە (ولید) م پرسی ئەو سی کەسە کینە ؟ وتی برووادار باوەری پییە ، دوو روو باوەری پێ نیە نانی پێ دەخوا ، لیرەدا باسی فەرموودەیەك دەکەین ابن حریر بەسەنەدەکی (المتصل)لە ( شفی بن مانع )لە بوهریرە پیغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿ خوای گەورە رۆژی قیامەتی دیتە خوارێ هەتا بریار لەبەینی خەلکی بدا هەموو ئومەتیك بەچۆك داهاتووە جا یەکەم کەس بانگ دەکرێ پیاوەکە قورئان خوینە ، پیاوەکە لەرێی خوا کوژراوە پیاوەکە دەولەمەندە جا خوای گەورە بەقورئان خینەکە دەلێ ئایا فیری قورئان خویندنم نەکردی کەبۆ پیغەمبەرەکەم ناردبوو ؟ دەلێ بەلێ ئەی خوایە دەلی چیت دەکرد بەقورئانەکە دەلی خوایە بەشەو بەرۆژ لەبەرە تور هەلدەستام قورئانم دەخویند جا خوای گەورە دەفەرموێ درۆی دەکەی فریشتەکان دەلین درۆی دەکەی خوا

---

(٢)فقة السنة

(٣)تفسير ابن الكثير مجلد ٣سورة مريم ٦/

دەفەرمووی نەخیر ، قورئان خویندنەکەت بۆ ئەوە بوو پیت بلین فلانەکەس قورئان خوین بوو هەتا دوای فەر مودەکە .. .. دوای پیغەمبەر (ﷺ) شەپەکی لەرانم داو جا وتی ( ئەی ئەبا هریرە ئەو سێ کەسە یەکەم خەلکی خوانە جەهەندەمیان پێ سۆر دەکریتەوە رۆژی دوایی . (النووی) رەحمەتی خوای لێبێ وتی نەفامەکان قورئان لەسەر جەنازەی دەخوینن بە (التمطيط)[1] وپیتی لەشوینی خۆی دەردەکەن ئەوەش حەرامە بەهاو دەنگی هەموو موسلمانان [2] .
لەتەفسیری ( الصاوی )لەسەر (الجلالين)داهاتووە لەسورەتی (الاعراف) ئایەتی ﴿ المص كتاب انزل اليك .. . الى آخر الآية ﴾ قورئان بۆ ئەوە هاتۆتە خوارێ کافران بترسین و بروادارات ئامۆژگار بکا حەلال نیە لەشتی تری بەکار بینی ، بۆ نمونە وەکو ئەو کەسانە لەریگاکان قورئان دەخوینن هەتا پارەیان بدەنێ ، یان بەدەنگ دەخوینن وەکو گۆرانی هەتا پارەیان بدەنی یا بەدەنگی خۆش لەزەتی پی وەرگری وەکو تام و لەزەت لەگۆرانی وەرد ..ری ئەوە گومرایی یەکی ئاشکرایە .
بەلێ هەندێ مەلای بێ ئاگا هەیە فەتوای دەدەن هۆدەکی لەسەر زەوی مزگەوتێ دروست بکەن هەتا خەلکی تازەی تیدا دانیشن ، زۆربەی خەلکی بەکردەوەیەکی باشی تیدەگەن و وا دەزانن خیرەکەی گەورەیەو بەلام وانیە بەلکو وا دادەنرێ ئەو پارچە زەوییە لەمزگەوت داگیرکراوە وەهەر کەسێ بۆتە هۆی دروست کردنی ئەوە عەزابی خوای بەپارەی خۆی کریوە وەکو لەفەرمودە داهاتووە ﴿ من غصب قدر شبر من ارض طوقه الله فى سبع اراضى يوم القيامة ﴾ واتە هەر کەسیك بستە خاکیك داگیر بکا رۆژی قیامەتی خوا هەر حەوت زەوییەکانی لەملی دەکا ) مەگەر دروست کردنی ئەو هۆدە دروستە ئەگەر خاوەن مزگەوت دروستی کردبی پیش وەقف کردنی ئەو زەوییە بۆ مزگەوتێ . یەکیك لەو بیدعە خراپ و تەسەروفە ناشیرنە ناشەرعیانە لەهەندیك تازیان دەبینی کۆمەلە

(١) التمطيط ) یانی دریژ کردنەوە ولەراندنەوە
(٢) فقة السنة مجلد ١ ص٥٢٩

خەلکیکی تازیەکەی لەدەرەوەی مزگەوت رادەوەستێ پیشوازی لەمیوانان دەکەن پیشوازیەکی سەیر لەکاتی پیشوازی کردنەکە رکوعی دەبەن دەچیە ئەو لاتر کۆمەلیکی تر لەحەوشی مزگەوت راوەستاینە کومەلیکی تر لەدەرگای مزگەوت دانە ، کۆمەلیکی تر لەناو ژوری مزگەوت دانە ، میوانەکان بەکەیفی خۆیان جغارە دەخۆن لەکاتی قورئان خویندنی ، لەناو مزگەوتێ قسان دەکەن چۆن لەبازاری قسان دەکەن دوایی هەلدەستن دەرۆن و گوناهەکانیان لەسەر پشتیان بار دەکەن ، پاشان کۆمەلیکی تر دێن ئەبەم جۆرە ئەو مەراسیمە دووبارە دەبیتەوە وشەرمیش لەخوا ناکەن وەقەت گویشمان لەمەلایەکی نابێ پێیان بلێ بابە ئەوە عادەتەکی نەفامی‌یە دروست نیە بە تایبەتی لە مزگەوتی کە ئەوەیان لە ناشیرنترین کاری حەرامیانە هەر وەکو (شافعی) رەحمەتی خوای لی بی لە عەلی دەگیریتەوە (رەزای خوای لی بی) ( زەمانەك بەسەر خەلك دادی هەر بەناوموسلمانن ، قورئان هەر وینەکەی لایان دەمینیتەوە مزگەوتی زۆر دروست دەکەن بەلام لە زیکری خوا ویرانە خراپترین خەلکی ئەو زەمانی مەلایەکانن فیتنە لە وان دەردەچی و هەر بۆ وان دەگیرنەوە ) . هەر بۆ نموونە تەنیا یەك نمونەتان بۆ دەگیرمەوە لەسەر تەسەروفاتی و فتوای یەك لەو بەناو مەلایە بی ئاگایانەیە ئەویش ئەوەیە :- لە یەکیك لە مزگەوتی شارەکەمان تازیەك هەبوو بانگدەر بانگی نویژی عسری دا مەلاکە هاتە لای خەلکی تازیەکە یەکیك هات پرسیاری لە مەلا کرد ئەری مامۆستا چۆن نویژی بە کۆمەل بکەین جیگامان نیە مەلا ووتی کورم چ قەیدی نیە تازیە زەروریە ، مەلابە هەموو عەقلی خۆی نموونەیەکی هیناوە ووتی ئەو کەسەی نانی بخوا دوایی لە گەروی گیربی دروستە فرەکی ئارەق بخوا هەتا نەمری ئەوە گوناح نیە جا حالی ئیمەش لە مزگەوتی ئەو هایە . توخوا مەلا ئەوە قسەیە ، تەماشاکەن نویژی بە جەماعەت ناکری لەبەر ئەوەی مزگەوت تازیەی لیە ئایا ئەوە لە گوناهە گەورەکان نیە ؟! لە پەراوی (الکبائر) لە گوناهی (٦٥) دا هاتووە تەرکی نویژی بە کۆمەل لە

له پەڕاوی (الكبائر) لە گوناهی (٦٥) دا هاتووە تەركی نوێژی بە كۆمەڵ لە گوناهە گەورەكانە خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان داوە نوێژی بە كۆمەڵ بكرێ لە شەڕو ناخۆشی و لەكاتی ترس كەچی مەلا مەندیل سپی لەلای خەڵكی تازیەی دانیشتوە ڕانە مریشكی دەخوا و قرتێنەی دێتەوەو گوێ بە نوێژی بە كۆمەڵ نادا لەبەر تازیەی . لە هەندێك زاناكانی شافعی وەرگیراوەو وتویانە هیچ بیدعەیەك كەلە ئیسلام ئاشكرا بووبی لە بیدعەی جغارە خواردنێ خراپتر نییە ، ئەمنیش ئەو قسە دەخەمە پاڵ قسەكانتان و دەڵێم تازیەش لە مزگەوتێ دانان لە جغارە خواردنێ خراپترە .

## بەشێك لە ڕوونكردنەوەی حوكمی جغارە خواردنێ

## (ئەو جغارە خواردنەی ئەمڕۆ لەو زەمانە بلاوبویتەوە )

لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەی زانستە پزیشكییەكان دا دەركەوتووە كاریگەری جغارە خواردن زیانی زۆرە لەسەر لاشەی مرۆڤ و هەرچی دەبێتە هۆی نەخۆشی ترسناكەكان لەوانە نەخۆشیەكانی دڵ و شێرپەنجە و نەخۆشیەكانی تر هەروەكو لای هەموان ئاشكرایە جغارە خواردن زیانی ئابوری و كۆمەلایەتیشی هەیە ، بەلام ئێمە ئەو لایەنە بۆ پسپۆرانی بەجێ دێلین ئێمە هەر لایەنی ئاینی یەكەی وەردەگرین بەشێوەیەكی كورت وەكو لە پەراوی (التحفة المرضية)دا لە لاپەرە (١١٢) دا هاتووە و دەڵێ بزانە و خوا كارت بۆ ڕێك بخاو لە بیدعە زیان بەدین و دونیای شاراوە بت پارێزی شێخ (شهاب الدين القليوبي) خوا بە زانستەكەی سودمان پێ بگەینی فەرمووی گوێم لە حەكیمە داناو زاناكان بووە كە حیكمەتیان بەقسەو بەكردەوە هەبوە و جێی باوەڕ بوون وتویانە جغارە خواردن توشی مردنی نیوەی لاشەت دەكاو بەرچاوت تاریك دەكا و حەزی چونە لای ئافرەتیشت كەم دەكا ، منیش دەڵێم (نووسەر) جغارە خواردن دڵ ڕەق دەكاو لە زیكری خوا بێ ئاگات دەكات ، وە لە سوننەتی پاكی

پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتووە قەدەغەی لە هەموو شتەکی پیسی بۆن ناخۆش کردوەو فەرمانی داوە بەبەکار هێنانی بۆنی خۆش و پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەموو بیدعەیەك گومڕاییە وە هەموو گومڕاییەك لە ناو ئاگردایە ، هەندێ زانایانی شافیعی مەزهەب دەگێڕنەوە و ووتویانە هیچ بیدعەیەك لە ئیسلام بەدەر نەکەوتووە هێندەی جغارە خواردن شەیتان کەیفی پێ بێ . بەڵێ بەکار هێنانی جغارە حەرامە وە فرۆشتنی باتلە یانی (کڕین و فرۆشتنی دانامەزرێ) چونکە یەك لە مەرجەکانی فرۆشتنی شت دەبێ سودبەخش بێ و بەشەرعی دابندرێ بۆیە زاناکان هەموویان لەسەر هەندێ کۆکن بە فیڕۆدانی ماڵ با کەمیش بێ لەو شتەی زیانی هەیە و قازانجی دونیاو دوا ڕۆژی نیە هەر حەرامە وە هەموو کەسیش دەزانێ جغارە لە غەیری زەرەر هیچ سوودی نییە جا ماڵ خەرج کردن لە شتێ زیانی هەیەو قازانجی نیە حەرامە چۆن یەکیشە ئەوەی جغارەی دەخوا دەوڵەمەندبی یا هەژار جا ئەو کەسانە سوونەتیان وون کردوەو کەوتوونەتە دوای بیدعە بەڵام جغارە خواردن لە کۆڕی قورئان خوێندن و زانست دا ئەوە زۆرتر حەرامە ، وە ئەو کەسەی قورئانەکە دەخوێنی هیچ پاداشتی نیە بەڵکو هەر زۆر گوناهباریشە هەروەکو لە باسی تازیەی باسمان کرد وە دەڵێم جغارە خواردن بیدعەیەو نەخواردنی سونەتە وە پەیڕەوکردنی سوونەتیش چاکترە لە تووش بوونی بیدعە جا لە سەر مرۆڤی ژیر پێویستە ڕێگەی هیدایەت بگرێتە بەر زیانی پێ ناگەینی با کەمیش بن وە دوور بکەویتەوە لە ڕێگەی گومڕایی و فریو نە خوا بەزۆربەی جغارە خواردن کە بە دەستی خۆیان لە ناو دەبەن وە منیش دەڵێم ( ئەو ئاگرەی جغارە هەر زۆر دەبی بە درێژایی ژیانی هەتا دەمری ئەو کاتە ئەو ئاگرانەی جغارەکانی دەبێتە ئاگری جەهەنەم و دەخرێتە ناوی ) وەرگێڕ .

# بەشێك لە بانگ دان

لە شێخ محمد عبدەی فتوا دەری وڵاتی مصریان پرسی دەربارەی صەلەوات لێدانی پێغەمبەری (ﷺ) لە دوای بانگێ ، ئەویش وەڵامی داوە ووتی لە ( كتاب الخانیة) دا هاتووە بانگ دان تەنها ئەو (١٥) پازدە وشەیەكە نوسراوە وە دوا ووتەی بانگ لای ئێمە ( لا أله الا الله)یە وە ئەوەی لە پێش بانگ یا لە دوای بانگ دەیڵێن هەر هەموی تازە پەیدا بووە و بیدعە چیەكان دایان هێناوە بۆ ئاواز دانان (التلحینی) هیچی ترنیە ، وە ئەو ئاواز دانانەش كەس ناڵێ‌ێ دروستە ، وە گوێ بە قسەی ئەو كەسانەش نادرێ كە دەڵێن ئەو شتانە بیدعەیەكی باشە (حسنة) چونكە هەر بیدعەیەك لە بەندایەتی كردن بۆ خوا و لە سەر ئەم شێوەیە خراپە و بیدعە دابەش ناكرێ ، وە هەر كەسێ ڕای بگەێنێ و بڵێ ئەوە ئاواز دانانی تێدا نیە ئەو كەسە درۆزنە [1] . ئەو فەرموودەی (ابن خریج) لە (عطاء) ئەویش لە (ابن عباس) بە پێغەمبەری ووت بانگدەرەك هەیە گۆرانی بە بانگی دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ ان الاذان سهل سمح فان كان اذانك سهل سمحا والا تؤذن ﴾ [2] واتە : بانگ دان سوك و ئاسانە ئەگەر بانگەكەت سوك و ئاسانە ئەوە بانگدە ئەگەرنا بانگ مەدە .

گۆرانی وتن بە بانگێ و ئاواز دانان بەزیاد كردنی پیتێك یا جولەیەك یا درێژی كردنەوەی پیتێك ئەوە ناپەسندە (مكـروه) بەڵام ئەگەر بووە هۆی گۆڕینی مانا شارینەوەیەكی ئاگادار كردنەوە ئەوە حەرامە و دەبێ زۆر وریاش بن لەو هەڵانەی كە دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی بانگدان ، وە هەر كەس بە ئەنقەست وە بكا بەڵكو كافر دەبێ وەكو درێژ كردنەوەی پیتی (باء اكبر) وە (هەمزەی اشهد) وە (الف الله) و نوتق نەكردنی (بهاء الصلاة) وە بێجگە لەوانەش . [1]

(١)فقه السنة مجلد الاول ص١٣٢

(٢) تفسیرالقرطبی ص٢٢٠ العائدة / ٥٨

(يحيى البكاء) ووتى (ابن عمر) م ديت دەيوتە پياوەكى ئەمن لەبەر خواى ڕقم لێت دەبێتەوە ، دوايى بە هاوەڵەكانى ووت دەزانن بۆ بەو پياوەم روت ڕقم لێت دەبێتەوە ، چونكە گۆرانى بەبانگى دەڵێ و پارەى لەسەر وەردەگرى . بێجگە لە هەردوو بانگدانەكان ئەو (سبحان الله) كردن و سرود ووتن بە دەنگ و دوعا كردن و ئەو شتانەى لە بڵند گۆكان دەوترێن هەر هيچيان سوننەت نينە وە هيچ زانايەكيش نالێ وتنيان شتەكى باشە بەڵكو هەموويان بە بيدعە ناپەسندەكانيان دەزانن ، چونكە لەسەر دەمى پێغەمبەر (ﷺ) و لە سەردەمى سەحابەكان ئەو (كە يار كردنە) نەبووە ، هيچ بنچينەيەكيش نيە كە لە سەردەمى وان كرابێ وە هيچ كەسيش فەرمانى بەكردنى نەداوە هەتا بكرێ ئەگەر مەرجى كردنى پێوە هەبێ ئەوە پێچەوانە كردنى سوننەتە [2]. وە ئاواز بانگدان (مالك بن انس) پىَ‌ى زۆر ناپەسندە لە گەڵ زۆر زاناى ديكە چونكە بانگ دان لە شوێنى گەورايەتى خۆى دوور دەكەوێتەوە دەبێتە سرودوگۆرانى ووتن چونكە دەبينى بانگ دەر زكر كردن و سبحان الله ووتن و ئامۆژگاركردن تێكەڵ بەبانگى دەكاو بانگدانەكە دەخاتە ناوەندى يان و تێكەڵ بەيەك دەبن وە زاناكان دەڵێن هەرچى دەخرێتە پاڵ بانگدان ناپەسند (مكروه)[3] ، وە بزانە لە سەردەمى پێغەمبەر (ﷺ) جيهازى دەنگ گەورەكردن (مكبرة الصوت) نەبوو وە لە سەردەمى سەحابەكانيش هەر نەبووە وە لە زەمانى هەر چوار پێشەوايەكانيش نەبووە ئەنجا لە گەڵ هەنديش قەدەغەيان كردوە دەنگ لە مزگەوتێ بەرز بكرێتەوە ، چونكە نوێژ كەرو پياوى خەوتوو شەو نوێژكەر سەريان لێ دەشێوێ
(عمر بن الخطاب) بە (ابى محذور)ى ووت كاتێ داواى بانگ دانى لێ كرا بوو لە بانگدانێ زياد دەنگى خۆت بەرز مەكەوە چونكە دەترسم موسڵدانيت بتەقى[4].

(١) حاشية البجيرمي على الخطيب المجلد ٢ ص[43]

(٢) تلبيس ابليس ، ص[1]

(٣) فقه السنة ص[124]

(٤) تفسير القرطبي سورة لقمان / ١٩

بەلاَم ئێستا هەر هەموو مزگەوتێك بلَند گۆی تێدایە بانگ دەر یەك بە دەنگی خۆی پێش بەیانیان دەنەرێنێ و سبحان الله دەکا یا دوعایەکی یا قورئان دەخوێنێ بە قەسیدەی دەلَیٚ گەوارەی بوارانە هەمو خەلَکی زڕ خەو دەکاو کار لەو کەسانە دەکا شەو نوێژی دەکەن ئەمانە هەمووی شتی خراپ و بیدعەنە یا لە ڕۆژانی هەینی پێش وتاردان کاتیٚ خەلَك کۆ دەبنەوە هەندێك لە نوێژدانە هەیە لە ڕوکوعی دایە لە سوجدەی دایە هەیە لە بیر کردنەوەی دایە ، هەروەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) داهاتووە ، بیر کردنەوەی کات ژمێرێك خێری لە بەندایەتی کردنی (٦٠) شەست سالَی زیاترە [٥] جا لەو کاتەی بانگدەر یا قورئان خوێن لە پێش مایکرۆفۆنی دادەنیشی و دەست بە قورئان خوێندنیٚ دەکا نزیکەی نیو سەعات ئەو قورئان خوێندنە سەر لە نوێژکەرو ئەوانەی بە دلٚ لە خوا دەترسن و بیر کردنەوە تێك دەدا ، هیچ کەسیش ئینکاری ئەو قورئان خوێندنە ناکاو نالَیٚ کاکە بە دەنگ قورئان مەخوێنە چونکە دەنگ بەرز کردنەوە سەر لە نوێژکەری تێك دەدا ئەوەش حەرامە . شێخمان لە (شرح العباب) دەلَیٚ قورئان خوێندن بە دەنگ لە مزگەوتیٚ پێویستە حەرام بکریٚ ، امامی (النووی) بە ناپەسند (مکروە)ی دەزانی ئەگەر قورئان خوێندنەکە ئازار دانی خەلَکی کەم تێدابیٚ و لە مزگەوت نەبیٚ بنوارە (فتح المعین) وە هەندیٚ زانا لە سەر هەندیٚ سورن و دەلَێن ئەگەر یەکێك نوێژ بکا حەرامە قورئان خوێندن بە دەنگ یا هەر شتێکی تر بخوێندریٚ جا نوێژ کەر لێی تێك بچیٚ یان نا چونکە مزگەوت لە سەر نوێژ کەری تاپۆ کرایە نەك لە سەر ئەو کەسانەی ئامۆژگاری خەلَك دەکەن یا قورئان دەخوێنن [١] . وە ئەگەر زانایەك بلَێتە خەلَکی ئەگەر قورئان خوێندن بە دەنگ نوێژ کەری تێك بدا ئەوە حەرامە ڕەنگە خەلَکی نەفام و گێژو وێژ و مەلای بیٚ ناوەرۆك و بیٚ ئاگا و بیٚ زانست تاوانبارت بکەن و بلَێن ئەتوش بوویە (وەهابی) خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ واذكر ربك من نفسك تضرعا و خيفة و دون

(٥) تفسير الكبير سورة البقرة / ص ١٨٨

الجهر من القول ﴾ الآية واتە : وە یادی پەروەردگارت بکە لە دڵت وا بەگریان و زاری و بەترس و بەبێ دەنگی ئەو ئایەتەش گشتییە زکر کردن و قورئان خوێندن و دوعا کردن و ئەو شتانەی هەمووی دەگرێتەوە [٢] لە (البیاض) ووتی پێغەمبەر (ﷺ)هاتە ناو خەڵکی نوێژیان دەکرد ، خەڵکەکە دەنگیان بەرز کردەوە لە قورئان خوێندنەکەیان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ ان المصلی یناج ربە فلینظر بما یناجیە بە ولا یجهر بعضکم علی بعض بالقرآن لانە فیە أذی ومنعا من الاقبال علی الصلاة و تفریغ السر لها و تامل ما یناجی بە ربە من القرآن ﴾ واتە : نوێژ کەر گفت و گۆ لە گەڵ خوا دەکا با تەماشا بکا چۆن گفت و گۆی لە گەڵ خوا دەکا با هەندێکتان دەنگی بەرز نەکاتەوە وە لە قورئان خوێندنەکەیان چونکە ئازاردانی خەڵکی تێدایە دەبێتە قەدەغە کردنی ئەو کەسانەی دەیانەوێ نوێژ بکەن لێیان گەڕێن با نوێژەکانیان بە نهێنی بکەن و بیر بکەنەوە چونکە گفت و گۆی لە گەڵ خوای خۆیان دەکەن بە قورئان خوێندنەکەیان [٣] .(الامام مالك) ووتی هەر کەسێ بیدعەیەك لە ئیسلام دابنێ و بڵێ ئەوە بیدعەیەکی چاکە (حسنة) یە دیارە ئەو کەسە گومانی وایە موحەمەد خیانەتی لە ئیسلامدا کردوە چونکە خوا دەفەرموێ ﴿ الیوم اکملت لکم دینکم ﴾ واتە : ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو کرد [٤] . هەرچی لەو ڕۆژەی ئاین نەبووبێ ئەمڕۆش نابێتە ئاین .

## تێبینی: -

(الترجیع) لە بانگدانێ چەسپاوە ، ئەی بانگ دەر پێویستە لە سەرت دەست بە سوننەت وەبگری و واز لە بیدعە کردن بینە لە بانگدانێ (الترجیع) سوننەتە . (موسلم) لە (ابو محذورة) ڕیوایەتی کردوە پێغەمبەر (ﷺ) (ابو محذورة) ی وا فێری بانگ دان کردوە بڵێ الله اکبر الله اکبر ، أشهد أن لا الـه إلا الله ، أشهد أن محمد رسول الله ، أشهد أن محمد رسول الله دوای دەگەڕێتەوە سەر أشهد أن لا إلـه إلا الله ، أشهد أن لا إله إلا الله ، أشهد أن محمد رسول الله ، حی علی الصلاة دوو ڕەکەت حی علی الفلاح دووڕەکەت (اسحاق) ئەمەشی لێ زیاد کردوە الله اکبر ، الله اکبر لا إله إلا

الله ئەو فەرموودەیە بەڵگەیەکی ڕوونە لە مەزهەبی مالك و شافعی و احمد و جەماوەری زانایان که (الترجیع) لە بانگ دانیّ چەسپاوە شەرع داینـاوە مانـای (الترجیع) یانی گەڕانەوە بۆ شایەتی دانی لا إله إلا الله ، أشـهد ان محمد رسول الله دوو ڕەکەت بە دەنگی بەرز پاش ئەوەی دوو جار به دەنگی نزم دەیڵێتەوە [٥] .

ابن حجر لە (العباب) دەڵیّ ئەگەر لە یەکەم جار بە نهێنی وای نەوت ئەوە ئاشکرایە کە دوو جار وە بڵیّ .

(مەسەلەیەك) ووتنی (الترجیع) پێویستە ئەگەر گوێشی لیّ نەبیّ بە پێچەوانەی فەتواکانی (الرملی) و وێنەی (سم) لەسەر (التحفة) [١] . ئەی بانگ دەر ووتنی (الترجیع) تەرك دەکەی چونکە سونەتێکی نهێنییە لە نێوان خۆت و خودا بەڵام تەرکی (الصلاة خیر من النوم) ناکەی چونکە سونەتێکی ئاشکرایە لە نێوان و خۆت و خەڵکی دا ، ئەوە جیّ داخ و سەر سوڕمان نیە بانگدەری هەژار تەرکی ووتنی (الترجیع)ی کردەوە بەڵکو جیّی سەرسوڕمانە و مەرەقە ئەوەیە خۆبیّ دەنگ کردنی مەلایەکانە فەرمان بەبانگ دەرەکان نادەن و بڵێن ، جا نازانم هۆیەکەی چییە ، لەلەبەر نەزانی مەلایەکانە یا باوەڕیان بەفەرموودەی ئیمامی (موسلیم) و قسەی مالك و شافعی احمد و جەماوەری زانایان نیە یا ئەوەتە لە زانست بیّ ئاگانە یا لەبەر تەمبەڵییانەو ناتوانن تەماشای کتێبە شەرعیەکان بکەن خۆ ئەگەر ووتنی (الترجیع) بیدعە بوایە خۆ ئەوەی بیّشك وگومان مەلایەکان دەیانگۆتە بانگ دەرەکان بڵێن.

---

(١)اعانة الطالبين ص٨٩ المجلد ٢

(٢) تفسير البيضاوى

(٣) شرح الزرقانى على موطا مالك ص١٦٨

(٤) انيس المؤمنين ص٧٥

(٥) شرح النووى على صحيح مسلم مجلد ٢ ص٨١

# بەشێك دەربارەی مزگەوتەكان

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ فی بیوت اذن الله ان ترفع ویذكر فیها اسمه یسبح لـه فیـها بالغدو والاصال رجال لا تلهیهم تجارة ولا بیع عن ذكر الله و اقام الصلاة وایتاء الزكـاة ﴾ [٢] واتە : لە نێو خانوانێك خوا رێی داوە بەرز بكرێنەوە و ناوی خوای لە نێو بەرن و لەبەرەبەیانداو ئێوارانـدا نـاوی خـوا بەپاكی ببەن پیـاوانێك كـە هیـچ بازرگانی و مامەڵەیەك ئەوانی لە یـادی خـواو لـە نوێـژ كـردن و زەكـات دان بـێ ئاگایان ناكا . حەسەن بصری و زانای تر ووتویانە (ترفـع) مانـای بەگـەورە زانینـی و پلە بەرزی و پـاك ڕاگرتـن دێ لـە پیسـو پۆخڵـی وەكـو لـە فـەرموودە داهاتووە ﴿ ان المجلس ینزوی مـن النجاسـة كمـا ینزوی الجلـد مـن النـار ﴾ واتـە : دەبێ مزگەوت لـە پیسی پاك بكرێتـەوە وەكـو پێستـە بـەئاگر پـاك دەبێتـەوە . پێغەمبەر (ﷺ) بە (معاویـة بـن الحكـم السـلمی) فەرموو نـابێ قسـەی دونیـایی لـە مزگەوتان بكرێ ، چونكە مزگەوت شوێنی سبحان الله، الله اكبر قورئان خوێندنە ، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ئەگەر یەكێكتان هاتە مزگەوت بادانەنیشـی هـەتا دوو ركات نوێژێ دەكا . لە فەرموودەی ڕاستی (موسلیم) دا هاتووە لـە ئەبوهریرەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ من غدا الی المسجد او راح اعـد الله لـه نـزلا فـی الجنـة كلمـا غـدا ام راح ﴾ واتـە : هەركەسـێ بەیانی یـا ئێوارە بچێتـە مزگـەوت خـوای گەورە لە بەهەشت ماڵێكی بۆ ئامادە دەكا هەر چەند جار بێ و بچی . هەر ئەبو هریرە ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ صلاة الرجل فی جماعة تزید علی صلاته فی بیته و صلاته فی سوقه بضعاوعشرین درجة و ذلك ان احدهم اذا توضا فاحسن الوضـوء ثـم اتی المسجد لا ینهزه الی الصلاة لا یرید الا الصلاة فلم یخط خطوة الا رفع لـه بـها درجـة وحط عنه بها خطیئة حتی یدخل المسجد فاذا دخل المسـجد كـان فی الصلاة مـا كانت الصلاة هـی تحبسه والملائكة یصلون علـی احدكم

(١)كتاب العد العین ، ص[١٢] (٢) سورة النور / ٣٦

ما دام في مجلسه الذي صلى فيه يقولون اللهم اغفر له اللهم تب عليه مالم يؤذ فيه مالم يحدث فيه .﴾ واته : نوێژی ئەوپیاوەی بە کۆمەڵ نوێژ دەکا مزگەوتی لە نوێژ کردنی ماڵێی یا بازاڕێ خێری زیاترە بە (٢٧) پلە ئەمە ئەگەر یەکێکتان دەست نوێژێکی جوانی شوشت دوایی هاتە مزگەوت تەنیا نوێژ هێنابیو مەبەستی نوێژ کردن بی هیچ هەنگاوێك ناوێ مەگەر خوا پلەیەکی پێ بەرز دەکاتەوەو گوناهەکی پێ ڕەش دەکاتەوە هەتا دێتە ناو مزگەوتێ ، کاتێ هاتە ناو مزگەوت ، ئەوە وەکو ئەوە وایە لە نوێژ کردن دابی مادام نوێژ لە مزگەوت بلێتەوە وەفریشتەکان صەلەواتی لەسەر لێدەدەن مادام لەو کوڕەی دابی کە نوێژی لێ کردوە صەلەواتی فریشتەکانیش ئەوەیە دەڵێن ئەی خوایە تۆبەیان لێ قەبوولێ بکە مادام ئازار دانی خەڵکی تێدا نەبێ و قسەی تێدا نەکرێ یا بێ دەست نوێژ بسەردانەیە . (حكيم بن رزيق) ووتی بە (سعيد بن المسيب) یان ووت ئایا هاتنە سەر جەنازەت پێ خۆشترە یا لە مزگەوت دانیشی ، (سعيد) ووتی هەر کەسێ نوێژی لەسەر جەنازەی بکا (قيراط) ەکی بۆ هەیە ، هەر کەس ئامادەی شاردنەوەی جەنازە بێ دوو (قيراط) ی بۆهەیە بەلأم لە مزگەوت دانیشتنم پێ خۆشترە لەبەر ئەوەی فریشتەکان دەڵێن خوایە لەو بەندەی خۆش بە ڕەحمی پێ بکە خوایە تۆبەی لێ قبول بکە .

(عمر بن خطاب) گوێی لە دەنگی پیاوەکێ بوو لە مزگەوتێ ، بەپیاوەکی ووت ها کابرا چ دەنگە دەنگتە نازانی لە کوێی . (خلف بن ايوب) لە مزگەوتێ دانیشتبوو کوڕەکەی هاتە لای پرسیاری شتەکی لێ کرد ، (خلف) هەستا لە مزگەوتێ هاتە دەرێ ئەنجا وەلأمی داوە ، وتیان ئەوە بۆ وات کرد فەرمووی لە فلانە ساڵەوە قسەی دونیایم لە مزگەوت نەکردوە ئێستاش پێم ناخۆش بوو قسەی لێ بکەم . ئەبوهریرە ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ من سمع رجلاً ينشد ضالة في المسجد فليقل لا ردها الله عليك فان المسجد لم تبنى لهذا ﴾ واتە : هەر کەسێ گوێی لە پیاوێك بوو لە مزگەوتێ بانگ ڕادێری بۆ شتێ وون بوو بابڵێ

خوا شتەکەت بۆ نەدۆزێتەوە چونکە مزگەوت بۆ هەندێ دروست نەکراوە . پێشەوا (مالك) و کۆمەڵێ زانای تر تەنانەت پێیان ناخۆشە بۆ زانست و شتی تر دەنگ لە مزگەوت بەرز بکەنەوە . (عمر بن خطاب) لە ووتارێکی فەرمووی ئەی خەڵکینە ئێوە سیرو پیاز دەخۆن منیش لام پیسن چونکە پێغەمبەرم دیت ئەگەر پیاوێك بۆنی بکردبایە لە مزگەوت دەری دەکرد و دەیناردەوە (البقیع) ووتی ئەو کەسەی پیازی دەخوا با جوان بیکوڵێنی هەتا بۆنی دەڕوا [1] . (مالك بن دینار) ووتی پێم گەیشتوە خوای گەورە دەفەرموێ ( من دەمەوێ عەزابی بەندەکانم بدەم دوایی تەماشای ئاوەدانی مزگەوتەکان و قورئان خوێنەکانی منداڵەکانی ئیسلام دەکەم تووڕەی یەکەم دادەمرکێتەوە، لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی : لە ئاخر زەمان کەسانەك دێنە مزگەوت و هەلقە هەلقە دادەنیشن زکر کردنیان باسی دونیایەو خۆشەویستی دونیایە لە گەڵ ئەو کەسانە دامەنیشن چونکە خوا هیچ پێویستی بەو کەسانە نییە ! [2] (السائب بن یزید) ووتی لە مزگەوتێ ڕاوەستا بووم پیاوێك پلە بەردێکی تێ گرتم کە ئاوڕم دایەوە دیتم (عمر بن خطاب) بوو فەرمووی بڕۆ ئەو دوو کەسەم بۆ بێنە چووم هەردووکیانم هێنا لای فەرمووی ئێوە خەڵکی کوێن ووتیان خەڵکی (الطائف) ین (عمر) وتی ئەگەر خەڵکی شاری دەبوون .

دەمزانی چۆنم لێ دەدان ئەوە ئێوە لە مزگەوتی پێغەمبەری (ﷺ) دەنگ و بەرز دەکەنەوە . [1] هەندێ خەڵکی نەفام و مەلای بێ ئاگا لەو زەمانەی هەنە مزگەوتیان کردۆتە شوێنی تازیە دانان و جغارەی بۆن ناخۆشی لێ دەخۆن و قسەی دونیای تێدا دەکەن چۆن لە بازاڕو دەلال خانەی قسان دەکەن و هیچ شەرمەکیش لە خواو پێغەمبەر وشەریعەتی ئیسلام و ئەو مەندیلە سپییەی سەریان ناکەن کە دەڵێی گومەتە لە سەریان ناوە .

---

(1) اخرجه مسلم فی صحیحه

(2) تفسیر القرطبی المجلد ١٢ ص ٢٧٧ .

**تێبینی : -**

له پەرتووکی (فتح المعین) لاپەڕە (٢١) دەڵێ نوێژ کەرو ئەوانەی تر لە مزگەوت دانە حەرامە دەنگیان بەرزکەنەوە لە مزگەوتێ لەبەر ئەو کەسانەی نوێژی دەکەن یا سوونەتە هەروەکو لە (المجموع) دا هاتووە وهەندێ لە زاناکان دەڵێن قەدەغەیە بە دەنگەی بەرز قورئان بخوێندرێ باشتی تر بخوێندرێ کە نوێژ کەر نوێژی پێ لێ تێك نەچێ چونکە مزگەوت لە سەر نوێژ کەران تاپۆ کراوە نەك لەسەر ئەو کەسانەی ئاۆمژگاری خەڵك دەکەن یا قورئان دەخوێنن پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ صلاة فی مسجدي افضل من الف صلاة فیما سواه الا المسجد الحرام وصلاة فی المسجد الحرام افضل من مائة الف صلاة فیما سواه ﴾ [٢]واتە : نوێژ کردن لە مزگەوتی من خێری زیاترە لە هەزار نوێژی مزگەوتی تر مەگەر لە (المسجد الحرام) نەبێ نوێژی مزگەوتی (المسجد الحرام) خێری زیاترە لە ١٠٠/٠٠٠ سەد هەزار نوێژی مزگەوتی تر ( ابی سعید الخدری) وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ لا تشد الرحال الی ثلاثة مساجد المسجد الحرام و المسجد الاقصی ﴾ [٣] واتە : خۆ توند کردن بۆ چوونە ئەو سێ مزگەوتە نەبێ دروست نی‌یە مزگەوتی (المسجد الحرام) مزگەوتی من و مزگەوتی ئەقصا . ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێ گەیشتنی کورت هەڵهێنانە کە حەرامە خۆ توند کردن و سەفەر کردن بەمەبەستی غەیری ئەو سێ شوێنە وەکو زیارەتی پیاو چاکان چ مردوو بن چ زیندووبەنیازی نزیك بوونەوە لە خواوە بەمەبەستی شوێنی گەورە شوێنی گەورە بە نیازی (تەبەڕوك) کردن و نوێژی لێ بکەی وە شێخ (ابو محمد الجوینی) و کۆمەڵی زانای تر بۆ ئەوە چوونە ئەوە بەڵگەیە لەسەر هەندێ کە (اصحاب السنن) ڕیوایەتیان کردوە (ابی بصرة الغفاری) ئینکاری چوونی ابو هریرەی کرد کە چووە کێوی‌ڕهوار بە ابو هریرە ی ووت کە پێش ئەوەی دەرچی بۆکێوی‌حوار بتگەیشبامە تۆ نەم دەهیشت بچی بەلگەش ئەو فەرموودەی بۆ هینایەوە ئەبو هریرەش قسەکەی پی‌خۆش بوو ووتی راست دەکەی (٤) لە

فەرموودەی (ابی سعید) هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ اذا جاء احدكم الى المسجد فلينظر فان راى فى نعليه قذر أو اذى فليمسحه وليصل فيهما ﴾ وهذا صحيح صححه الائمة واتە : ئەگەر یەکێکتان هاتنە مزگەوت باتەماشای نەعلەکانی بکا ئەگەر دیتی پیسی پێوەیە با بیسرێتەوە و نوێژی پێوە بکا (هیچ جیاوازی نێوان نەعلی ئێستاو ئەو کاتی نییە) (ابن اوس) لە باوکیەوە ورتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ خالفوا اليهود فانّهم لا يصلون فى نعالهم ولا خفاهم ﴾ [1] واتە : پێچەوانەی جولەکەکان بکەن چونکە ئەوان نوێژی بەنەعل و خوفەوە ناکەن

# بەشێك لە نوێژ كردن

پێش ئەوەی دەست بەم باسە بکەین پێم خۆشە باسی فەرموودەیەك بکەین دەربارەی دەس نوێژ شوشتنێ لەبەر گرنگی . (عمر)ورتی پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ﴿ ما منكم من أحد يتوضا فيسحن الوضوء ثم يقول ((اى وهو قائم متقبل القبلة)) أشهد أن لا إله الا الله وحده لا شريك له وأشهد ان محمد عبده و رسوله الا فتحت له ابواب الجنة الثمانية يدخل من ايها شاء ﴾ [2] واتە : هەر کەسێك لە ئێوە نیە دەست نوێژەکی جوان بشوا دوایی بە پێوە ڕوو لە قیبلە بڵی (أشهد أن لا إله الا الله وحده لا شريك له وأشهد ان محمد عبده و رسوله) مەگەر ئەوە خوا هەر هەشت دەرگای بەهەشتی لێ دەکاتەوە بە کەیفی خۆی لە کامەیان دەچێتە ژوورەوە . خوای گەورە دەربارەی هاوەڵەکانی جەهەنەم فەرموویەتی ﴿ ما سلككم فى سقر قالوا لم نك من المصلين ولم نك نطعم المسكين وكنا نخوض مع الخائضين وكنا نكذب بيوم الدين حتى اتانا اليقين فما تنفعهم شفاعة الشافعين ﴾ واتە : چ شتێك ئێوەی بەرەو دۆزەخ ڕاکێشا دەڵێن لە نەنوێژ کەران بووین وە خۆراکمان بەهەژاران نەدەدا وە هەمیشە لە گەڵ قسە پوچان دابووین وە ڕۆژی دوایی مان بەدرۆ ئەزانی تا مەرگمان گەیی . وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ بين العبد وبين الكفر ترك الصلاة﴾ واتە : جیاوازی لە نێوان بەندەی موسڵمان و پیاوی کافر تەرك

کردنی نوێژە ، هەروەها فەرموویەتی ( العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر ) (٣) واتە ئەو پەیمان و بەڵێنەی لە نێوان ئێمەو گاورەکا دایە نوێژکردنە هەر کەسێ نوێژ تەرك بکا ئەوە هەر کافرە نوێژ نەکەری بە ئەنقەسەت بە پێی مەزهەبی جمهور گوناهبارە دەبێت وە گێڕانەوەی لەسەر واجب دەبێت ، ابن تمیمە دەلێن نوێژ نەکەری بە ئەنقەست گێرانەوەی نوێژەکانی بۆ نیە بەڵکو سوننەت زیاد بکات ، ابی حنیفە ومالك وشافعی دەڵێن نوێژەکان دەگێڕێتەوە پاش دەرچوونی کات ، هەتا مالیك و ئوبو حنیفە دەڵێن یەکێك بە ئەنقەس نوێژی نەکرد دەیگێڕێتەوە پێش ئەو نوێژەی کە کاتی هاتووە ئەگەر ئەو نوێژەی بە ئەنقەسەت نەیکردووە پێنج نوێژ یان کەمتر بێ ئەوا دەیگێڕیتەوە وە پێش ئەو نوێژەی کاتی هاتووە بەڵام ئەگەر زیاتر بوو لە پێنج نوێژ ئەوا دەیگاێرێتەوە دوایی ئەو نوێژەی کاتی هاتووە(*) لە ( انس ) ی ووتی پێغەمبەر ﷺ ( اخف الناس صلاة في تمام ) واتە نوێژی لە هەموو کەس سووك تر بەتەواوی دەکرد ( القاضي ) وتویەتی نوێژ کردن ئەوەیە کەمی قورئان تێدا بخوێنێ و دوعای کورت لە ڕکاتەکان بکەی‌وە تەواوەتی نوێژ کردنیش ئەوەیە هەموو ڕوکنەکان سوننەتەکان مانەوە لە سوجدەو ڕکاتەکان بە ئەندازەی ووتنی ٣ جار سحان الله کردن بێت (٤) لە ( المرقات ) القاري ) ووتویەتی‌مانای نوێژی سووك کردنەوەیە یانی پێغەمبەر لە غەیری شوێنەکانی خۆی نوێژی درێژ نەکردۆتەوە وەکو پێشەوا گەورەکان لە زەمانی ئێمە دەیانکرد پیتەکانیان درێژ دەکردەوە بە ئەندازەی سروشتی خۆی بە ئەندازەی (٣) الف بوو لە ( عبد الله ) ووتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی ( اذا ركع احدكم فقال في ركوعه سبحان الله ربي العظيم ثلاث مرات فقد تم ركوعه وذلك ادناه واذا سجد فقال في سجوده سبحان ربي العلى ثلاث مرات فقد تم سجوده وذلك ادناه ) واتە ئەگەر یەکێکتان ركوعی برد لە ڕکوعەکی (٣) جاران بڵێ ( سبحان الله العظيم ) ئەوە ڕکوعەکەی تەواوە ئەوەش لایەنی کەمەکەیتی وە ئەگەر سوجدەی برد بالە سوجدە بردنەکەی (٣) جاران بڵێ ( سبحان ربي الاعلى ) ئەوە سوجدە بردنەکەی تەواوە ولایەنە کەمەکەیتی ( احمد ) ووتویەتی ( سبحان الله ) ووتن لە ڕکوع سوجدەی و ووتنی ( سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد ) و زکرەکانی نێوان سوجدەکان و ووتنی هەموو

---

١ ) عون المعبود شرح سنن ابي داود مجلد ٨ ص٢٥٤

٢ ) رواه الخمسة الا البخاري وازاد الترمذى ( اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين )

٣ ) تحفة الاحوذى شرح جامع الترمذي المجلد ٢ الحديث ٢٣٧

٤ ) رواه الترمذى وابو داود ( التاج ص ١٩٠ )

(*) فقه السنة ج ١

(الله اكبر)ەكان لە نوێژ پێویستن (واجب)ن جا هەر كەسێ شتێكی لە وانە تەرك كرد بەئەنقەستی ئەوە نوێژ كردنەكەی بەتاڵە . ئەگەر لە بیری چوو نوێژەكەی بەتاڵ نابێتەوە بەڵام سوجدەی سەهوی دەوێ ( سوجدەی سەهوو ئەوەیە بەر لە سەلامدانەوە دوو سوجدان بباو ئەنجا سەلام بداتەوە ) ئەوە قسەی ڕاستی ئیمامی (احمد)ە وە لە ڕیوایەتی تری (احمد) وەكو جەماوەری زانایان دەڵێ ئەو شتانە سوننەتن وە ئەو كەسانە دەڵێن ئەو شتانە لە نوێژ پێویستن بەڵگەیان ئەو فەرموودەی (عقبة بن عامر) ی‌یە كە فەرموویەتی ﴿صلّوا كما رأيتموني‌اصلي﴾ واتە : نوێژ بكەن وەكو چۆن نوێژێ دەكەم . وە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وسجوده ... ﴾ وە تەنیا لە نوێژ كردن پێویستە جا هەوڵدە نوێژەكەت وابێ [1] (غەزالی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ وتویەتی نوێژ كەر گفتو گۆ لە گەڵ خوا دەكا وەكو لە فەرموودە دا هاتووە قسە كردنیش لە گەڵ بێ ئاگایی پێی ناگوترێ گفت و گۆ كردن وە هیچ گومانیشی تێدا نی‌یە مەبەست لە قورئان خوێندن و زكرەكان و حەمدو سەنا و پاڕانەوە قسە كردن لەگەڵ خوایە جا ئەگەر دڵ و دەروون داپۆشراو بوو بەپەردەی بێ ئاگایی و بێ ئاگا بوو لە گەورایەتی خوا هەر زمانی بۆ خۆی دەجولا بەحوكمی عادەت ئەوە زۆر دوورە خوا ئەو نوێژەی وەربگری[2] . خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ و اذكر ربك في نفسك تضرعا و خيفة و دون الجهر من القول ﴾ لە پێشەوە كراوەتە كوردی مەبەست لە زكر كردن ئەوە هەر لە دەروونی خۆیتی زانا بێ بەمانای ئەو زیكرانەی كە بەزمانی دەیڵێ و دڵی ئامادە دەكا بۆ سیفاتە تەواوەكانی خوای گەورە چونكە ئەو زیكر كردن بە زمان ڕووت بێ لە زكر كردنی بە دڵ ئەوە هیچ سودێكی نی‌یە [3] . بەڵام لە بارەی تەرك كردنی نوێژی بە كۆمەڵ ئەوە لە گوناهە گەورەكانی شەســـــت و

(١)عون المعبود شرح سنن ابي داود حديث ٨٥٧

(٢) تفسير الكبير المجلد ١٢ سورة المؤمنون

(٣) تفسير الكبير سورة الاعراف / ٢٠٥

پێنجی پەرتووکی (الکبائر) لاپەرە ٢٥٥ دا هاتووە بریتییە لەوەی تەرکی نوێژ بە کۆمەڵ بکەی بۆ خۆت بەتەنیا لە ماڵەوە نوێژان بکەی بەبێ عوزر (ابن المنذر) وتوویەتی بانگ و قامەت بۆ هەموو نوێژەکی بە کۆمەڵ پێویستە چ نیشتەجێ بی چ لەسەفەردابی چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە بانگدان داوە ، فەرمانی ریش دیارە پێویستە [٤] ، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ یوم یکشف عن ساق و یدعون الی السجود فلا یستطیعون خاشعة ابصارهم ترهقهم ذلة وقد کانوا یدعون الی السجود وهم سالمون ﴾ واتە : رۆژێ لاق هەڵئەکرێ و بۆ سوژدە بردن بانگ دەکرێن جا ناتوانن چاویان داهێشتۆتە خوارێ و پەستی ئەوانی داگیر گرتووە ، بەر لەمەش بۆ سوژدە بردن بانگکرابوون کەوا ساغ و سەلامەت بوون (کعب الاحبار) ووتی ئەو ئایەتە لە شانی ئەو کەسانە هاتە خوارێ کە لە نوێژی بە کۆمەڵ دوا دەکەوتن لەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتە هەڕەشەی توند هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە نوێژی بە کۆمەڵ فەرزە لەسەر هەموو کەسێکی چی نوێژەکە تایبەتی بی پیێ وەکو نوێژی هەینی بەڵگەش ئەو فەرموودە پێغەمبەر (ﷺ) ﴿ لا صلاة لجار المسجد الا فی المسجد ﴾[٥] واتە : ئەو کەسەی جیرانی مزگەوتە نوێژی بۆ نیە مەگەر نوێژی مزگەوت نەبێ .

ئەو پینج نویژانە یەکیك بیان پاریزی ( بەریکی و بە بەردەوامی ) رۆژی قیامەت رزگار دەبیت بۆی دەبنە نور ( روناکی ) و برهان ( بەلگە ) وە ئەوەی نەیان پاریزی رۆژی قیامەت نە رۆناکی و نە بەلگەو نە رزگاری دەبیت لەو رۆژەی لەگەل دەبیت . ئیبن و عباس ، رەزای‌خوایان لی بیت فەرمووی کەسیك گوێی لە بانگدانی نوێژ بوو وەلامی داوەو نەهاتە مزگەوت ، نوێژەکە دەکات ، نویژەکەی دروست نی یە و لە خواو پیغەمبەر عاسی ( یاخی) بووە خوای گەورە دەفەرمووی (( انما یعمر مساجد من أمن بالله والیوم الآخر ))(١) ( الشافعی ) وتویەتی ئەو کەسانەی توانایان هەیە بینە نویژی بەکۆمەل روخستەتیان نادەمی بەبی عوزرنیە نە نویژی (٦) ( عرباض بن سارية ) وتی پیغەمبەر (ﷺ) (٣) کەرەت دوعای بۆ ریزی یەکەم دەکرد وە یەك جار دوعای بۆ ریزی دووەم کرد (١) دوعای بۆ ئەوانی تر نەکرد بەلکو وادەی ئاگری پی دەدان ئەگەر بەردەوام بن لە دوا کەوتنی نویژی بە کۆمەل ، ئەبو داود ریوایەتی کردوە ( بەردەوام کۆمەلیك لە ریزی یەکەم لە نویژ کردنی بە کۆمەل دوا دەکەون هەتا خوا دوایان دەخا لە ئاگر .

٤) تفسیر القرطبي ٥) فرحة ابوداود وصححه وغیر ٦) تفسیر القرطبي سورة البقرة

(٢) هەروەکو گەورایەتی ڕیزی یەکەم چەسپاوە ، گەورایەتی لای ڕاستەش بە هەمان شێوە چەسپاوە وە ئەبو داود ڕیوایەتی کردوە خواو فریشتەکان صەڵەوات لە سەر ریزی لای ڕاستەوە لێ ئەدەن هەر خوا زاناترە . وە فەرموودەیەك هەیە باسی ئەکەین دەربارەی سووك کردنی نوێژی بە کۆمەڵ و ڕێك و پێك کردنی چونکە بە گشتی سودی بۆ برِوا دەران هەیە بە تایبەتی بۆ مەلایان ( ابن مسعود ) ووتی پیاوێك هات ووتی ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا ئەمن لەبەر ئەوە لە نوێژی بەیانی دوا ئەکەوم فلانە کەسێ چونکە نوێژەکەی زۆر دوورو درێژە و زۆرمان ڕادەگرێ ( عبدالله ) ووتی پێغەمبەرم ئەوەندە بە توورەیی نەدیبوو وەکو توڕەبوونی ئەو ڕۆژەی ، دوایی فەرمووی بەڕاستی سەیرە پێوە خەڵکی لە نوێژ کردنی بە کۆمەڵ دەرەوێنەوە ، هەر یەکێتان پێش نوێژی بۆ خەڵکی کرد با نوێژەکەی بە سووکی بکا چونکە پیاوی بێ هێزو پیرو خاوەن کار نوێژی لە دوایی ئەکەن بەڵام ئەگەر بۆ خۆتان نوێژتان کرد چەندی پێتان خۆشە نوێژەکەتان درێژ بکەنەوە (٢) لە عثمان بن أبي عاص ) ووتی پێغەمبەری خوا بمکە پێش نوێژی قەومەکەم ووتی تۆش پێش نوێژیان بۆ بکە بەڵام چاو لە بێ هێزترین کەسیان بکە بانگدەرێکی ڕابگرە بەڵام پارەی لەسەر وەر نەگرێ (٤) وە نوێژی سوننەت لە ماڵێ خێرە زیارتە تا لە مزگەوت . ( زید بن ثابت ) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ( صلاة المرء في بيته افضل من صلاته في مسجد هذا الا المكتوبات ) (٥) واتە : پیاو لە ماڵەکەی خۆی نوێژ بکا خێری زیاترە لە نوێژی مزگەوتەکەم مەگەر نوێژە فەرزەکان نەبێ ( سودێك ) دەرچونی پیتی ( الضاد ) لە شوێنی دەرچوونی خۆی گرانە لە سەر خەلکی (عەوام ) توانایان نیە دەریبرِن لە ( شرح الشاطبية ) کە ناونراوە بە ( كنز المعاني شرح حرز الاماني ) هی شيخ ابي عبدالله محمد بن احم ناودار بە ( شعلة الموصلي الحنبلي ) دا هاتووە دەڵێ ( پیتی الضاد ) و (الضاء ) و ( الذال ) لە بیستنیلەیەك دەچن وە پیتی ( الضاد ) لە ( الضاء ) بەئاسانی لێك نابنەوە مەگەر بە جیاوازی دەربڕیننەبێ وە زیادە درێژ کردنەوەی پیتی ( الضاد ) نەبێ ئەگەر لێ یان بێ ئاگابوون هەردوك وەکو یەکیان لێ دێ ( فخر الدين الرازي ) ووتەیەتی پیتی ( الضاد ) بە ( الضاء ) چواندن نوێژی بەتاڵ ناکاتەوە چونکە بەڵگە هەیە بەیەك چوندنەکی زۆر لە نێوان هەردوو پیت دا هەیە وەلە یەك جیا کردنەوەیان گرانە . جا بۆیە پێویستە تەکلیف کردن بە جیا کردنەویان نەمێنێ لە ( فتوى ) قاچی خان دا هاتووە ئەگەر ( الضالين ) بە ( الضاء ) یابە ( الذال) خوێندراوە لو نوێژی تەێژیەکە تێك ناچێ بەڵام ئەگەر ( الضالين ) بە ( الدال) یان بە ( لام ) خوێندراوە ( کە هەندێ مەلا وا دەخوێننەو ) ئەوە نوێژەکە تێکەچێ.

## (جوله کردن له نوێژ)

ئەوەی خەڵك بە کەمی دادەنێ لو نوێژ زیانی نیە وەکو وەڵام دانەوەی سەلام بە ئیشارەت،لە پێ کردنەوەی کەوش و بەرز کردنەوەی مەندیل یان دانانی و لەبەرکردنی جلێکی سوك یان لەبەر ك ردنەوەی یان هەڵگرتنی منداڵی بچوك و دانانی یان پاڵ نانی تێ پەڕبوو لابردنی بلەسەر لەش و ئم جۆرە شتانە بەڵام ئەوەی کە خەڵك بە زۆری دادەنێ ئەوەی نوێژ بە تاڵ ئەکاتەوە چەند

١ ) رواه النسائي والحاكم وصححه ٢ ) رواه ابن ماجة وصححه ٣ ) رواه الخمسة ٤ ) رواه الخمسة الا البخاري

هەنگاوێکی لە دوای یەك بەجۆرێك کەسێك لە دورەوە ببیینی بێگوما کە ئەوەی لە نوێـژ دانیە ، زۆربەی زاناکان لەسەر ئەوەن کە ئەو شێوەی نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە ئەگەر لەدوای یەك بێت بەڵام ئەگەر پچراو بێت وەك ئەوەی هەنگاوێك باوێن و ئەمێك ئارام بگرێت ئینجا هەنگاوێك یان دوو هەنگاوی باوێ دیسان ئارام بگرێتەوە زیانی نیە ئەگەر بێیتە سەد هەنگاویشبەم جۆرە ، ئیمامی نەوەوی ووتی جوو لەسەکەکان وەکو پەنجە جولاندن یان خوراندنەش ئەوەی راست و دیارە نوێژ پێ ی بەتاڵ نابێ هەر چەندە لە دوایی یەکیش بێ بەڵام مەکروهە ، ئیمامی شافعی رحمەتی خوای لێبێ ئەفەرمووێ ئەگەر ئایەتەکانی قورئان بژمێرێت بە ئەست نوێژەکەی بە تاڵ نابێت بەڵام واباشتر نەیکات *بوون هەردوك وەکو یەکییان لێدێ ( فخرالدین الـرازی ) ووتویەتی پیتی ( الضاد ) بە الضاء ) چواندن نوێژی بە تاڵ ناکاتەوە چونکە بەڵگە هەیە بەیەك چوندنەکی زۆر لە نێوان هەدوو پیت دا هەیە وە لە یەك جیا کردنەوەیان گرانە . جا بۆیە پێویستە تەکلیف کردن و جیا کردنەوەیان نەمێنێ لە ( فتوی ) ی قاچی خان دا هاتووە ئەگەر ( الضالین ) بە الظاء ) یابە ( الذال ) خوێندراوە لە نوێژی نوێژەکە تێك ناچێ بەڵام ئەگەر ( الضالین ) بە ( الـدال ) یان بە (لام ) خوێندراوە ( کە هەندێ مەلا ئەخوێننەوە ) ئەوە نوێژەکە تێك ئەچێ . سودێك پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەنەعلەوە کردوە دوایی هەر لە نوێژی لە پێ ی کردەوە وە خەلکەکەش لە پێیان کردەوە دوایە ئەوەی سەلامی داوە ووتی ئێوە بۆ نەعلەکانتان لە پێ کردەوە ووتیان ئەتۆمان دیت لە پێت کردەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی جبرائیل هات هەواڵی دامن نەعلەکانت پیسن لە پێیان کەوە ، بۆیە منیش لە پێم کردەوە ، وە پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی ناخۆش نەبوو نوێژی بەنەعلەوە بکا ، بەڵکو ئینکاری سەحابەکانی کردوە کە نەعلییان لە پێکردەوەو پێ ە فەرموون من بۆیە نەعلەکانم لەبەر کردەوە چونکە پیس بوون (١) ( جا هیچ جیاوازیەکیش لە نێوان نەعلی ئێستاو ئەو کاتی نیە با هەر هەندی کۆلکە مەلا وەبلێن )

( مەسەلەیەك ) هەندێك لە ئیمامەکان ( الله اکبر ) ی نوێژ دابەستان و سەلام دانەوەی نوێژ درێژ ئەکەنەوە بەڵام ( تەکبیر ) جەزمەو سەلام دانەوەش جەزمە واتە نابێت درێژ بکرێنەوە . لە ئەبو هوریرە خوای لێرازی بێت وەرگیراوە کە پێغەمبەر ( (ﷺ) ) فەرمووی ( سەلام دانەوە سوننەتە ( حەزف ) بێت واتە سووك ووتن و درێژ نەکردنەوەی داوا کراوی شەرعە ، ئەو فەرموودەی ابراهیم النخعی پشتگیری ئەمەیە کە هاتووە تەکبیر جەزمەو سەلام دانەوە جەزمە واتە نابێت درێژ بکرێتەوە ( ترمذی ) هی تریش وا ئەڵێن ئەوەش پەسندە لە لای ئەهلی عیلم واتە زانایان ( ١)

١) رواه النسائی والحاکم صححه

٢) رواه ابن ماجة وصححه بلفظ کان یستغفر للصف المقدم ثلاثا والثانی مرة

٣) رواه الخمسة ٤) رواه الخمسة الا البخاري ٥) رواه ابو داود

# بەشێك لە نوێژ كردنی تەراویح

بزانە نوێژی تەراویح كردن سونەتە ، زاناكان لەسەر ئەوە رێكەوتن كە بریتی یە لە بیست ركات وە لە دوای هەردوو ركات سەلام دەدرێتەوە ، وەسیفەتی نوێژەكانیش هەروەكو نوێژەكانی ترە و دوایی باسی هەموو زكرەكانی پێشی دەكەین وەكو دوعای (الافتتاح) و تەواو كردنی هەموو زكرەكان و بەجێ هێنان تەحیات و دوعاكانی دواوەی بێجگە لەوانە هەر چەندە لاتان ئاشكرایە بەڵام ئەوەی ئاگادارم كردنەوە لەسەری چونكە زۆر خەڵك هەنە نوێژی تەراویحی زۆر بەسووكی دەكەن و زكرەكان ناكەن وە زۆر زاناكان ئەوەیان هەڵبژاردووە قورئان لە نوێژی تەراویح بخوێندرێ و وتویانە خەڵك قورئان خوێندنی تێدا بەجێ بێنن و كاری پێ بكەن و قورئانی تێدا ختم بكەن بەدرێژایی مانگی رەمەزانێ وەهەر شەوەی یەك جزمی قورئانی تێدا بخوێنن ، وە سونەتە قورئانی بەتەرتیل لێ بخوێنن لە نێوان نوێژەكان زۆر وریا بن لە درێژە پێدانی قورئان خوێندنی لە جزمەك زیاتر [٢] . بەڵام ئەو نوێژە تەراویحەی ئێستا كەبە پەلە (مسابقة) دەكرێ یەكێكە لەو بیدعە فاشی یانەی كەلەبەر نەزانی و تەمبەڵی مەلایەكانەوە دەكرێ . وە لە (التحفة) دا هاتووە بریاری لەسەر ئەوەیە لەو حالەتانە نوێژی بەتەنیا لە نوێژی بەكۆمەڵ چاكترە نەخوازە لا ئەگەر نوێژ كەر زانی یا گومانی وابوو مەلا هەندێ روكنەكان بە تەواوی ناكا لەو كاتە ئەسلەن هەر دروست نی یە ئەم مەلایە نوێژی لە دوا بكرێ [٣] . ئەو (حدیث)ەی دەفەرموێ ﴿ الامام ضامن فان احسن فله ولهم وان اساء فعليه ولا عليهم ﴾ [٤] واتە : مەلا زامنی نوێژە ئەگـــــەر نوێژەكەی

(١)تفسير الكبير المجلد ٢٢ ص١٨

(٢) الاذكار النووى ص١٦٦

(٣) بغية المسترشد ص٦٧

(٤) فقه السنة ص٢٤١

بەباشی کرد ئەوە خێری دەگاتە خۆی دەگاتە نوێژکەرەکان بەڵام ئەگەر نوێژەکەی بەخراپی کرد ئەوە خێری ناگاتە خۆی بەڵام دەگاتە نوێژکەرەکان .
وە لە فەرموودەی ڕاست دا هاتووە ﴿من سنة في الاسلام سنة حسنة كان له اجرها واجر من عمل بها بعده من غير ان ينقص من اجورهم شئ ومن سن في الاسلام سنة سيئة كان عليه وزرها ووزر من عمل بها بعده من غير ان ينقص من أوزارهم شئ ﴾ [1] واتە : هەر کەسێ ڕێبازەکی باش لە ئیسلام دابنێ پاداشتی بۆ هەیە و وە ئەو کەسەی دوای ویش لەسەری بڕوا پاداشتی بۆ کابرا هەیە بێ ئەوەی پاداشتی وان کەم بێتەوە ، وە هەر کەسێ ڕێبازەکی خراپ دابنێ لە ئیسلام ئەوە گوناهی بۆ خۆی هەیە وە ئەو کەسانەی دوای ویش لەسەری دەڕۆن گوناهیان پێ دەگا بەبێ ئەوەی گوناهی وان کەم بێتەوە . (عبد الله) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ اذا ركع احدكم فقال في ركوعه سبحان ربي العظيم ثلاث مرات فقد تم ركوعه وذلك ادناه و اذا سجد فقال في سجوده سبحان ربي الاعلى ثلاث مرات فقد تم سجوده وذلك ادناه ﴾ [2] . لە سەر مەلایە سونەتەکانی نوێژی تەراویح تەواو بکا کە شەرع باسیان کردوە ، بەهەقی خۆی بیان کا زیاد نەبی لە فیتنە چی‌یان بی وە نەکەمیش لە خائینان بی . وە هەر کەسێ بیر بکاتەوە دەزانی ئێستا هەندە مەلای مزگەوتان هەیە دزی لە نوێژی دەکەن و خائینن چونکە ئەگەر مەلاکەمی کرد لەوەی داوای لێ کرایە نوێژەکەرەکانیش سەبارەت بەوی کەمی دەکەن چونکە نوێژی لە دوا دەکەن جا مەلا دەبێتە زامنی کەم و کوڕی نوێژەکەی و نوێژکەرەکان هەروەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) داهاتووە (مەلا زامنی نوێژە) یانی کەفیلی نوێژی نوێژکەرەکانی دواوەی خۆیتی بە تەواوی . نوێژکردنی تەواو ئەوەیە هەموو ڕوکنەکان و سونەتەکان بکەی و لە سوجدە وروکوع بەئەندازەی سێ جار ووتی سبحان الله بمینێتەوە [3] . هەندێ خیانەت هەیە لە نوێژی دەکرێ بۆ نموونە مەلاڵە بەر بەپەلە کردنی نوێژەکەی تەرکی ئەو زکرانە دەکا کە لە نوێژی تەراویح داهاتووە . هەندێ خیانەت هەیە لە نوێژی

تەراویح دەکرێ ئەویش لەبەر پەلەپەل کردنی مەلا لە نوێژێ ئەو زیکرانە ناکا کە لە نوێژێ دا هاتووە کە ئەم خیانەتانەی لای خوارەوەیە :-

خیانەتی یەکەم : مەلاو نوێژکەرەکان لەگەڵ یەك پێکەوە فاتحە دەخوێننێ و دەچنە ڕوکوع و سوجدە بەم جۆرە گەورایەتی‌نوێژی بەکۆمەڵ دەفەوتێ هەروەکو لە (بغية المسترشدين) لە لاپەڕە (٨٠) دا هاتووە .

خیانەتی دووەم : تەواوەتی نوێژ ئەوەیە نوێژەکە بە هەموو ڕوکنەکان و سونەتەکانەوە بکرێ و لەسوجدەو ڕکوع بەئەندازەی ووتنی ٣جار سبحان الله بمێنیتەوە ، ئەگەر شتێکی لێ کەم کراوە دەبێتە خیانەت کردن .

خیانەتی سێیەم : ئەگەر مەلا کەم و کوڕی هەبوو لەو شتانەی لە نوێژ کردن داوای لێ کراوە ئەوە نوێژکەرەکانیشی لەبەر مەلا نوێژەکەیان بەکەم و کوڕی دەکەن چونکە نوێژ لەدوای ئەو دەکەن بۆیە مەلا دەبێتەزامنی کەم و کوڕی نوێژکەرەکان وەکو لە فەرز داهاتووە (مەلا زامنە یانی کەفیلی تەواوەتی نوێژ کەرەکانە ) جا مەلا لەسەریەتی نوێژەکەی بەڕێك و پێکی بکا چونکە تەواوی نوێژەکەی تەواوی نوێژەکەی نوێژکەرانە وە مەلا هێندەی وانیش خێری دەگاتێ بەڵام ئەگەر کەم و کوڕی هەبوو لە نوێژەکە ئەوە هەر دەگەڕێتەوە بۆ مەلاو نوێژی نوێژکەرەکان تەواوە .

خیانەتی چوارەم : هەندێ مەلا لەگەڵ نوێژ کەران پێکەوە فاتحەی دەخوێنن و نوێژکەرەکان پێ ڕاناگەن بڵێن ئامین لەبەر پەلەپەل کردنی مەلای چونکە فاتحەی پێکەوە دەخوێنن . وەکو لە فەرموودەی بخاری و مسلم دا هاتووە ئەگەر ئیمام ئامینی کرد ئێوەش لەدوای ئامین بکەن هەر کەسێ ئامین کردنەکەی ڕێکی

(١)تفسير القرطبى سورة القيامة / ١٣

(٢) رواه الترمذى و ابو داود

(٣) تحفة الاحوذى شرح جامع الترمذى م/٢ ص٣٧

ئـامينى مـــەلاى كـــرد ئـــەوە فريشـــتە ئـــامينى لەســـەر دەكـــات و ھـــەموو گوناھەپێشووەكانيان خۆش دەبێ .
خيانەتى پێنجەم : يەك لە بيدعە ھەرە خراپەكان ئەوەيە ھەندێ مەلا تەراويحى سورەتى (قـل ھـو الله احـد) بەدوو جـاران دەخوێنـن لەھـەردوو ڕكاتـان ئايـا لـە سەحابەكان گوێى لێ بووە ئايا شتى واتـان لـە ھيـچ كتێبـەكى شـەرعى ديتـوە ؟!
لە ھيچ ئايەت و فەرموودەك شتى وا ھەيە ! ئەدى پێغەمبەر (ﷺ) نـەى فـەرمووە (صلوا . . . ) كراوەتە كوردى لە پێشەوە ڕواڵەتى فەرموودەكە بۆ پێويست بوونـە قەت پێغەمبـەر (ﷺ) نيوەى سورەتى (قـــل ھـــو الله احـــد) ى لـە ڕكـاتى يەكـەم نـەخوێندوە وەنيوەكـەى تريـش لـە ڕكـاتى دووەم بخوێنـى ! (القـــاضى) وتويـەتى شتەكى باش نيە لە مانگى ڕەمەزانێ قورئان ختم نەكرێ چونكە خەڵك گوێيـان لە ھەموو قورئـان نـابێ وەلـە ختـم كردنيش زيـاتر نـەبى چونكـە ئەگـەر زيـاتربوو لەسەر نوێژكەرەكانى پشت مەلاى گران و نـاخۆش دەبى (ابـو ذر) ووتـى لەگـەڵ پێغەمبـەر (ﷺ) ڕاوەستاين ھـەتا ترسـايـن پارشـيو خواردنمـان بچـى قورئـان خوێنـى وا ھەبوودوسەد ئايەتى دەخوێند . (عمار بن ياسر) ووتـى پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووى ﴿ ان الرجل ليصرف اى من صلاته وما له وما كتب له الاعشـــرها تسـعها ثمنـها سبعها خمسها ربعها ثلاثها نصفها ﴾ واتە : پياو ھەيـە لـە نوێژەكـەى دەبێتـەوە ھيچـى بـۆ نانوسـرێ مەگـەر دەيـەكى نۆيـەكى ھەشـتێكى ، حـەوتێكى ، شەشـێكى ، پێنجـەكى ، چواريـەكى ، سـێيەكى نيـوەى نـەبێ جـا پيـاو ھەيـە نوێـژ دەكـا پاداشتى ھيچى بۆ نانوسرێ بەو ئەندازەى بەئاگا بووە لـە نوێژەكـەى و ترساوە و بەدڵسۆزى بۆ خواى گەورە كرديەتى . ھەندێ كەس ھەيە نوێـژێ دەكـا بـەلاّم دەڵـێى لەسـەر پۆليـە ڕاوەسـتاوە ، دەڵـێى كۆتـرە تەقلـەى لێ دەدات ، جـا ئەگـەر كەسێك لەبەر دەستى خوا ڕاوەستى و پـێى نـاخۆش بـى خزمـەتى خـوا بكـاو بەپەلـەبى ديـارە خـواى گـەورەش خزمـەتى ئـەو بـەندەى پـێ خـۆش نيـە (والله المستعان) جابر دەڵێ ھەركەسێ ڕكاتەك نوێژى كرد بەس فاتحەى تێدا نـەخوێند

ئەوە وەکو ئەوە وایە نوێژی نەکردبی مەگەر لە دوای مەلاوە نەبی [1] بەڕواڵەت وا دیارە نوێژکەر لە دوای مەلا خوێندنی فاتحەی لەسەر نی یە . وە خوای گەورەش فەرموویەتی ﴿ واذا قرئ القرآن فاستمعوا لـه و انصتوا ﴾ واتە : وە کاتێ قورئان دەخوێندرێ گوێی بدەنێ و بێ دەنگ بن هەروا لەبەر فەرموودەی (مسلم) گێڕاویتیەوە (اذا كبر الامام فكبروا واذا قرأ فانصتوا فلا فاتحة على المـاموم ) واتە : کاتێ مەلا الله اکبری کرد ئێوەش الله اکبر بکەن و نوێژ دابەستن ، کاتی مەلا قورئانی خوێند ئێوە گوێ بگرن فاتحە خوێندن لەسەر نوێژکەری دواوەی مەلای نیە ، جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن هەروەها (احمد و مالك و ابـو حنيفـة) ش لەسەر ئەوەن بەڵام (ابـو حنيفـة) دەڵێ خوێندنی فاتحەی نوێژکەران لە دوای مەلای لە نوێژە بە دەنگەکان ناپەسندە ، وە الشافعي وەڵامی ئەو قسەی زوهری داوەتەوە کە دەڵێ وازیان لە قورئان خوێندن هێنا نابێتە بەڵگە لەسەر نەخوێندنی قورئان لە نوێژێ لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ( مـالي انــازع القـرآن ) واتە : قورئان بە دەنگ لە دەوام مەخوێنن لێم تێکەڵاو دەبێ بەڵکو هەردووکیان قورئان خوێندن بەئاشکرا قەدەغە دەکەن ، وەشافعي فاتحە لە سەر نوێژکەری پێویستە بخوێنێ لە دوای مەلا بەرەهایی (المطلـــق) لەبەر فەرموودەکانی پێشەوا بەڵام بە نهێنی بخوێنێ ، وە لە نوێژە بە دەنگەکان پاش ئەوەی مەلا لە فاتحە بۆوە ئەو کاتە نوێژە کەر پێش ئەوەی سورەتەکەی تر بخوێنێ ئەگەر نا هەر گوێ لە قورئان خوێندنی مەلای ڕابگری ئەوە شتەکی چاکەیە بەڵام ئەوەی لای جەماوەر ئاسان ترە ( والله اعلم) [1]

- **نوکتەیەکی ناسك**

کەم و کوری لە نوێژی تەراویح وەکو گۆشت فرۆشێکی وایە ، ڕانە گۆشتێکی لە سەر تەرازووی دانێ بیفرۆشێ پیاوێك پێی بڵێ گۆشتم دەوێ بەڵام ڕانە گۆشتەکە زۆرە ئەمن تەنیا یەك کیلۆ گۆشتم بەسە ، گۆشت فرۆشەکەش هەرچی

---

(1)رواه الترمذي

گۆشتی بە ڕانەکەی وەیە لێی کاتەوە کیلۆ هیسکێکی بۆ بیلیتەوەو بیداتە دەست پیاوەکە ئەویش بگەڕێتەوە مالی و بلێتە ژن و منالەکانی ها ئەوە کیلۆ گۆشتێکی ڕانم بۆ هێناون ، بەلام لە ڕاستی دا یەك کیلۆ هێسکە نەك گۆشتە .

بەشێك لەو بیدعانەی لە نوێژی هەینی دەکرێ ( مالك ) لە ( یحیی بن سعید ) ی وتی ( عبدالله بن سعود ) بە پیاوێکی ووت ئەتۆ لە زەمانەك دای شەرع زانی زۆرە قورئان خوێنی کەمە ، سنورەکانی قورئانی تێدا دەپارێزرێ بە زایع دەری پیتەکانی کەمن ( یان قورئانی بەتجویدەوە دەخوێنن ) ئەوەی داوا شتی لێ بکرێ زۆری دەدا ، نوێژی درێژ دەکەن ، وتاری کورت دەدەن ، کردەوەکانیان پێش حەزو ئارەزوەکانیان دەخەن ، بەلام زەمانەك بە سەر خەلکی دادێ شەرع زانی کەم دەبێ ، قورئان خوێنی زۆر دەبێ تەنها پیتەکانی قورئان لەبەر دەکەن ( یانی بێ تجویدەوە دەخوێنن ) بە زایەع دەری سنورەکانی قورئان زۆرن ئەوەی داوای شتی لێ بکرێ کەمی دەدا ، نوێژی کورت دەکەن خوتبەی درێژ دەدەن حەزو ئارەزوەکانیان پێش کردەوەکانیان دەخەن پارێزگاری لەسەر فرەوان کردنی تێگەیشتنی جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان دەکەن [2] ( الیبوطی) وتویەتی یانی ئەوانەی پارێزگاری قورئان دەکەن زۆر ترن لەوکەسانەی پارێزگاری لە سەر فرەوان کردن لە تێگەیشتنی جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئان دەکەن .

( البونی ) وتویەتی یانی فێر بونی سنورەکانی قورئان پێویستە و لەبەر کردنی پیتەکانی یانی خوێندنی هەر حەوت جۆرەکانی قورئان سوننەتە .

وە وشەی ( یقصرون الخطبة ) یانی کار بە سوننەت دەکەن .

( ابوعمر ) وتویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دەداو کردەوەی دەکرد ، پێغەمبەر (ﷺ) وتاری کورتی دەدا بە وشەی کەم و خۆش و پڕمانا زۆر قسە کردن زۆر

---

(١)کتاب التاج ص١٧٧

(٢)شرح الزرقانی علی الموطأ للأمام مالك ص٣٥٢ مجلد ١

ئامۆژگاری پێ ناخۆش بوو هەر ئەوەندەی دەووت کە لەبەری کەن ئەمەش بە وتار دانی کەم نەبێ ناکرێ .

( الباجي ) وتویەتی مانای ئاخر زەمان ئەوەیە وتار ئامۆژگاریە ونوێژ کردن کارێکە دەیەوێ بڵێ کردەوەیان زۆرە ئامۆژ گاریان کەمە وەرستەی ( اعمالهم قبل اهواءهم ) الباجي ) وتویەتی ئەگەر کردەوەی باش حەزو ئارەزووەکانیان پێکەوە نیشان بدرێ دەست بە کردەوەی باش دەکەن بەسەر حەزو ئارەزووەکانیان پێش دەخەن (قوله كثير قراؤة يحفظ فيه القرآن و تصيع حدوده) عەیبی لە ئاخر زەمان گرتووە یانی قورئان خوێندنەکان ناگەن و کاری پێ ناکەن مەبەستیان تەنیا خوێندنەوەی قورئانە ، قورئان خوێنی زۆر بەڵگەیە لەسەر گۆڕینی زەمانی لە پێغەمبەر (ﷺ)دەگێڕنەوە فەرموویەتی (اكثر منافق امتى قرأوها) واتە : زۆربەی قورئان خوێنەکانی ئۆممەتی من دوو ڕووەکانن . (مالك) وتویەتی ئەو کەسە دەبێتە قورئان خوێن هیچ خێری پێوە نىیە [1] . ئەی برایان خەڵك بۆ نوێژی هەینی کۆ دەبێتەوە لە حاڵەتی بەندایەتیجۆراو جۆر هەیە لە ڕوکوع دایە هەیە لە سوجدەدایە ، هەیە قورئان دەخوێنی ، هەیە زکری خوا دەکا ، هەیە بیر لە گەورایەتی خوا دەکاتەوە ... لەو کاتە پێش وتاداران بە ماوەیەك قورئان خوێن یا بانگدەر دێ دەست بە قورئان خوێندنێ دەکا بە (مكبرة) ی دەنگی دەڵێ گەوارەی بەهارانە توخوا ئەوە حەرام نیە ؟! وە هەندێ مزگەوت قورئان خوێنی نەبی (مسجل) ی قورئان لێ دەدەن وەکو ئەوە وابێ قورئان خوێندن لەوکاتەی پێویستە ، ئێمە ئینکاری ئەو بیدعانە دەکەین بەم بەڵگانەی لای خوارەوە یەکەم : خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وذكر ربك في نفسك تضرعا وخفية ودون الجهر من القول ﴾ واتە : وەیادی پەردگارت بکە لە دڵت بەگریان و زاری و ترس وە بەبێ دەنگی ئەوە بەڵگەیە لە سەر هەندێ دەنگ بەرز کردنەوەی زکر قەدەغەیە کە لە پێشەوە باس کرا .

دووەم : (ابن عباس) لە مانای ئەو بڕە ئایەتە ﴿ ودون الجهر من القول ﴾ دەڵێ واتە لە قورئان خوێندن دەنگ بەرز مەکەنەوە ئەو ئایەتەش مانای گشتی یە زیکرو قورئان خوێندن و دوعا سبحان الله و لا الـه الا الله و بێجگە لەوانەش دەگرێتەوە [٢] .

سێیەم : (البیاض) وتویەتی پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو خەڵکی نوێژیان دەکرد ، خەڵکەکە دەنگیان بەرز کردەوە لە ناو نوێژەکەیان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ ان المصلی یناجی ربە فلینظر بما یناجیە بە ولا یجهر بعضکم علی بعض القرآن لان فیە اذی و منعا من الاقبال علی الصلاة وتفریغ السر لها وتامل ما یناجی بە القرآن ﴾ . واتە : نوێژکەر گفت و گۆی لە گەڵ پەروەردگار دەکا جا تەماشا بکا بەچی گفت و گۆی لە گەڵ دەکا ، با هەندێك بە قورئان خوێندن دەنگی بەسەر هەندێك بەرز نەکاتەوە چونکە ئازارو بەرگری کردنی تێدایە لە ڕووکردنە نوێژێ و کات بەدەست وە بوونی نهێنی بۆ نوێژی و فکر کردنەوە لەو شتەی گفت و گۆی پێ دەکا بە قورئان .

چوارەم : خاوەنی پەرتووکی (تلبیس ابلیس) لە لاپەڕە ١٤٣ دەڵێ شەیتان فریوی کۆمەڵی قورئان خوێنی داوە کە لە مزگەوتەکان قورئان دەخوێنن لە کاتی پێش بانگدانێ چونکە کاتی کۆبونەوەی خەڵکە لە مزگەوتێ .

پێنجەم : بەڵگەی ئێمە مەبەست (نوسەرە) جا ئێمە ئاینەکەمان لە خەڵکی (الحرمین الشریفین) وەرگرتوە یانی مەکەو مەدینە ئەوان قورئان ناخوێنن بە دەنگی بەرز لە کاتی کۆبوونەوەی خەڵکی لە ڕۆژانی هەینی لە زەمانی پێغەمبەرەوەڕا هەتا ئێستا بۆ دەزانین ئەوە کردنی بیدعەیەکی کەس نەکردەیە (المنکرة)

---

(١) شرح الزرقانی علی الموطأ مالك ص٢٥٤

(٢) تفسیر البیضاوی و المدارك

(جابر) ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ غلظ القلوب و الجفاء فی المشرق و الایمان فی اهل الحجاز ﴾[1] واتە : دڵ ڕەقی و جەفادان لە ڕۆژ هەڵاتەوەیە وەبیر و باوەڕیش لە خەڵکی حیجازەوەیە قورئان خوێن لە ڕۆژی هەینی بەدڵ لە خوا ترسان (الخشوع) ی سەدان کەس تێك دەدا لەبەر کردنی بیدعە ئەویش ئەوەیە قورئان خوێن یابانگدەر بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنێ چونکە ناکرێ بەدڵ لە خوا ترسان و بیر کردنەوە لە گەورایەتی خوا لە گەڵ گرمەی (المکبرة) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ تفکر ساعة خیر من عبادة ستین سنة ﴾[2] واتە : بیر کردنەوەی کات ژمێرێك لە بەندایەتی کردنی شەست ساڵی خێری زیاترە . ئەی مەلا قورئان خوێن ، ئەی بانگدەر ئەمن تکاتان لێ دەکەم ئەگەر بەڵگەتان دیتەوە لەسەر قورئان خوێندنەکەتان ، یالەسەر سەڵەوات لێدان بەدەنگی بەرز کاتێ کە خەڵك بۆ نوێژی هەینی کۆ دەبنەوە بۆمان بێنن ئەگەر ڕیوایەتێك یا فەرموودەیەکی بێ هێز یا قسەی پێشەوایەکی سەلەف بێت ، ئەدی ئەگەر بەڵگەی نەبوو ئەوا پێویستە لەسەر زاناو مەلاکان ڕێنمایی قورئان خوێن و بانگدەرەکان بکەنەوە تەرکی ئەو بیدعەیە بکەن چونکە نوێژ تێك دان لە نوێژکەری حەرامە ئەدی ئەگەر بەسەدان کەس سەریان لێ تێك چووە دیارە ئەوە گوناهی گەورەترە .

## ئاگادار کردنەوە :-

سەلەفەکان قەدەغەیان دەکرد دەنگ بەرز بکرێتەوە لە مزگەوتەکان کاتی خەڵك کۆ دەبونەوە بۆ نوێژ کردن لە گەڵ ئەوەشدا لەو کاتی (مکبرة) نەبوو ، ئەگەر (عمر بن خطاب) چاوی دیار دەبوو دەبوایە چی لە قورئان خوێن و بانگدەرانەی ئەو زەمانەی بکردبایە کە یەك بەدەنگی خۆیان لە (مکبرة)ی هاوار دەکەن و سەر لەو هەموو خەڵکە دەشێوێنن دەی کەواتە ئەگەر قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز لە پێش وتاری هەینی یا لە پێش بانگی بەیانی ئاینی بوایە چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێمان نەدەکرد بیکەین یان چۆن سەحابە بەڕێزەکان نەیان دەکرد

، یا چۆن هەر چوار پێشەواکان باسی‌یان نەدەکرد . بیدعەیەکی تر کە لە ڕۆژی هەینی‌یان دەکرێ کە پێچەوانەی سونەتە ئەویش وتاری درێـژو نوێژکردنی کورتە یانی پێچەوانەی ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) ، بۆ نمونە ڕۆژەکی چومە نوێژی جومعە گوێم لە مەلایەکە بوو نزیکەی نیو سەعات ووتاری دا دوایی نوێژەکەی نزیکەی بە (٥) دەققان کرد ئەو بیدعەیە چەند لایەنەکی خراپی (السلبیات) تێدا هەیە کە ئەمانەی خوارەوەیە :-

یەکەم : درێژ کردنەوەی ووتار دەبێتە هۆی ماندوو کردنی گوێ گران چونکە پیرو نەخۆش و بێ هێزی تێدایە .

دووەم : ووتاری درێـژ باسێك دەگرێتەوە ناو خۆی ئەمەش لەسەر گوێ گران هەر گرانە هەمووی لەبەر کەن و کاری پێ بکەن ، بەلاّم وتاری کورت کە یەك باس بێ لەسەر گوێگران ئاسانە لەبەری بکەن و کارو کردەوەی پێ بکەن ، چونکە هەموو شتێك بە پلە پلە وەردەگیرێ نەك بەیەك جاری پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ رحمة الله على خلفائي فقيل من خلفاؤك يارسول الله قال الذين يحيون سنتي ويعلمونها عبادالله ﴾ واتە : ڕەحمەتی خوا لەسەر خەلیفەکانی من بێ وتیان خەلیفەکانی تۆ کامەیە ئەی پێغەمبەر فەرمووی ئەو کەسانەی سوننەتی من زیندوو دەکەنەوە و فێری بەندەکانی خوای دەکەن . (يحيى بن عقيل)وتی گوێم لە (عبدالله ابن ابي اوفى)بوو دەیگوت پێغەمبەر (ﷺ) زۆری زکر دەکرد نوێژی درێـژی دەکرد وتاری کورتی دەدا لەگەڵ بێوە ژنان و هەژاران دەڕۆی پێویستیەکانی جێ‌بەجێ دەکرد مەبەست ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی درێژتر بوو لەخوتبەدانی ( والله اعلم) .[1](ابو وائل) وتی (عمار)وتاری بۆ داین وتاری زۆر کورت و پڕ مانا بوو کاتی لەمین بەر هاتە خوارەوە وتمان ئەی (ابا اليقظان)زۆر بەکورت و پڕمانا وتارەکەت دا خۆزگە هەناسەیەکی تر قسەت کردبا وتی گوێم

(١)رواه مسلم

(٢) تفسير الكبير البقرة / ٣٣

لەپێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو ﴿ ان طوال الصلاة الرجل وقصر خطبتــه مئنـة مـن فقهه فاطيلوا الصلاة واقصروا الخطبــة وان مـن البيـان لسـحرا ﴾[٢] واتـه : وتـار کـورت کردنەوەو نوێژ درێـژ کردنـەوە پیـاو نیشـانەی لـەئاینی گـەیشـتنە جا نوێـژ درێـژ کەنەوەو وتار کورت کەنەوە باوتـار وەکو جادو کـار لەخـەڵکی بکـا . جابر دەڵـێ پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژانی هـەینی درێـژەی بەوتار نـەدەدا ، وتـاری چـەند وشـەیەکی سوك و ئاسان بوو . [٣]بیدعەیەکی تری ڕۆژانـی هـەینی ئەوەیـە بـانگدەر لـەنێوان بانگی یەکەم و دووەمی ڕۆژی هەینی دەڵێ ﴿ عن ابی هريرة قـال رسـول الله (ﷺ) الجمعة جمع المساكين وعيد المؤمنـين.. .. الخ ﴾ وە دەڵـێ ﴿ ان الله وملائكته يصلـون على النبي ياايها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما اللهم صل على سيدنا محمــد .. .. الخ ﴾ دەنگـی دەلەرێنێتـەوەو دووبـارەو دوای بەکۆڕسـی پێکـەوە دەڵێـن ئـامین بیکە ڕەمیکە ئامین الحمــد الله رب العـالمين . ئـەو قسـانە هێنـدە درێـژە پـێ دەدەن بەئـەندازەی وتـارەکی پێغەمبـەر (ﷺ) دەبـی . قسـەکان هـەر هـەمووی بیدعـەیە چونکە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)نـەکراوە لەسـەردەمی خـەلیفەکانیش نـەبووە ، وەنەلەسـەردەمی هــەر چـوار پێشـەوایەکنیش دەی کەواتــە قورئـــان خوێـــن و بانگدەرەکان نازانم ئەو قسانەتان لەچی سەرچاوەیەك دیتوە و کردوتانە بەشێك لەئاین بیدعەیەکی تری بانگدەری وەیە دەڵێ ﴿ صلو سنة الجمعـة ﴾ واتـه : نوێـژی سونەتی هەینی بکەن ( ابن تيمية ) وتویەتی (ﷺ) لەپێش جومعـەی پاش بانگی هیچ نوێژی نەکردوە وەکەسیش لێی نەگێڕاوەتەوە . لەسەردەمی پێغەمبـەر (ﷺ) دوو بانگ نەدەدرا دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)لە سەر مینبـەری دادەنیشت بلال بانگی دەدا پاشان (ﷺ) دووتـاری دەدا لـەدوای بلال قامـەتی دەکـردو پێغەمبـەر (ﷺ) نوێـــژی بەخـــەڵکی دەکـــرد ، کەواتـــە : نەپێغەمبـــەر (ﷺ) ونـــەهیچ موسلمانەکیش نوێژی نەکردوەلـەدوای مـەلا بـانگ دانـێ هیـچ کەسـێکیش لێی نەگێڕاوەتـەوە تەنانـەت نوێـژی لەماڵـەوەش کردبـێ پێـش نوێـژی هــەینی ، نەکاتیش هەیە بۆ نوێژ کردن دیـــــاری کرا بی بەفـــەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)

لەپێش هەینی بەڵکو فەرموودەکانی هەموو هاندانە بۆ نوێژ کردن کاتێ پیاو زوو بێتە مزگەوت لەڕۆژانی هەینی بەڵام بەبێ دیاری کردنی کات وەکو فەرمودەی ﴿ من بكر وابتكر ومشى ولم يركب وصلى ماكتب له ﴾ واتە هەر چەند زوو بێ یە مزگەوت وەبەپێ یان بێ‌ێ وەبەسواری نەی‌و ئەوەندەی بۆت کرا نوێژان بکەی ، ئەوە لەسەحابان گێردراوەتەوە ، کاتێ دەهاتنە مزگەوت ڕۆژانی هەینی هەر کاتێ دەهاتنە مزگەوت نوێژیان دەکرد ئەوەندەی پێیان دەکرا ، جا پیاوی واهەبوو (١٠) ڕکات نوێژ نوێژی دەکرد ، هی واهەبوو ١٢ ڕکاتی دەکرد واهەبوو (٨) ڕکاتی دەکرد ، واهەبوو کەمتری دەکرد لەبەر ئەوە جەماوەری پێشەوایان لەسەر ئەوە کۆکن لەپێش هەینی‌نوێژی سونەتی نی‌یە لەکاتێکی دیاری کراو بەژمارە چونکە ئەوە بەفەموردەی پێغەمبەر (ﷺ) یا بەکردەوەی ئەوە دەچەسپێ جا لەسونەتیشی هیچ شتی وانەهاتوە نەبەفەرموودە نەبەکردەوە (١).دوایی دەربارەی دوو بانگەدان لەڕۆژانی هەینی (سابت بن يزيد) ووتی لەڕۆژی هەینی کاتی خۆی هەر یەک بانگ دەدرا ئەویش کاتی پێشەوا لەسەر مینبەر دادەنیشت لەسەردەمی پێغەمبەرو ابو بکرو عمری بەلام کاتێ عوثمان بووە خەلیفەو موسلمان زۆر بوون بانگی دووەمی زیاد کرد لەسەر (الزوار) بانگ دەدرا ئەویش شوێنێکە لای بازاڕی مەدینە نزیک مزگەوتی[2]. وەئێمە بەدەوری خۆمان دەپرسین ئایا بانگی دووەم لەو زەمانەی زیادنیە کەوا (مكبرة)هەیەبی وەلامی ئەو پرسیارەی لەپەڕاوی (فتح المعين)داهەیە لەلاپەرە ٣١ دەڵێ دوو بانگدان لەڕۆژی هەینی یەکێکیان پاش ئەوەی دەچیە سەر مینبەر وەئەوەی تری لەپێش چوونە سەر مینبەرە ئەوە (عوثمان)دایهێناوە کاتێ خەڵک زۆر بوون بەڵێ بۆ کاتێ پێویست شتێکی چاکە بۆ ئەوەی خەڵك پێ ئامادە بێ ، ئەگەر نا یەك بانگدان چاکترەوبەسە .

---

(1)سنن النسائى شرح جلال الدين السيوطى مجلد٢ حاشية الامام سندى ١٠٥

(2)رواه مسلم (3)صحيحة١٩٩ عون المعبود المجلد ٣/

# بەشێ لەبەدڵ لەخوا ترسان ((الخشوع) )

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ قد افلح المؤمنون الذین هم فی صلاتهم خاشعون ﴾ واتە بەڕاستی بڕوا داران ڕزگارن کەسانێ کەلەنوێژ کردندا بەدڵ لەخوا دەترسن هەروەها فەرمویەتی ﴿ ان الذین آمنوا وعملو الصالحات واخبتوا الی ربهم ﴾ واتە (بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە کاری چاکیان کردووە لە خوا دەترسن )ە ووشەی (وَأَخْبَتُوا)ئاماژەیە بۆ کارو کردەوەکانی دڵ کەبریتی‌یە بەدڵ لەخوای گەورە ترسان ، وەکارو کردەوە باشەکان هیچ سودێکی نی‌یە مەگەر لەگەڵ کردەوەکانی دڵ نەبێ کەلەخوا ترسانە ، بیرو ڕای جۆراو جۆر هەیە لەوشەی بەدڵ لەخوا ترسان ( الخشوع) ئایا فەرزی نوێژە یا گەورایەتی نوێژە و نوێژی پێ تەواو دەبی. ئەوە دووقسەی تێدایە بەڵام قسەی ڕاست قسەی یەکەمە کەلەفەرزی نوێژ دێتە ژمار وەشوێنەکەشی دڵە وەیەکەم زانینە لای خەڵکی نامێنێ ( عبادة بن صامت ) ووتویەتی یەکەم زانست کەلای خەڵك نامێنێ بەدڵ لەخوا ترسانە نزیکە ئەو کاتە دابێ بچیە ناو مزگەوت ( الجامع ) ێکی تێدا نەبی بەدڵ لەخوا بترسێ ، بەڵێ بەدڵ لەخوا ترسان گیانی نوێژە لەسەرەوەی قورئان خوێندن و وشتی ترە هەروا هەرچی پەیوەندی بەزاتی بەندایەتی‌یەوە هەبی [3]وەکو خوای گەورە فەرموویەتی (ورتل القرآن ترتیلا) واتە : بەمۆڵەت و لەسەر خۆ قورئان بخوێنە یانی : لەسەر شتە سەر سوڕهێنەرەکانی ومانایەکانی ڕاوەستە هەروەها فەرمویەتی ﴿ قل ان صلاتی ونسکی ومحیای ومماتی لله رب العالمین ﴾ واتە : بلێ بەڕاستی نوێژم و خوا پەرستیم و ژیانم ومەرگم بۆ خوایەی پەروەردگاری جیهانیانە ئەوە بەڵگەی تێدایە لەسەر هەندێ هەرچی

(١)فقه السنة

(٢)تفسیر الخازن سورة الجمعة /٩

(٣)نهایة المحتاج شرح المنهج ص١٨٧

بەندايەتی يەك هەيە جێبەجێ نەكرێ بەهەقی خۆی وەرناگيرێ چونكە هەرچی شتی بۆ خوايی دەبێ تێرو تەواو بی بەپاكیو دڵسۆزی بی جا ئەگەر بەمجۆرەو سيفەتە بێ ئەوە خوا وەری دەگرێ . ئەگەروتيان ئايا دەڵێن بەدڵ لەخوا ترسان واجبە لەنوێژی ؟! دەڵێن بەڵێ لای ئێمە واجبە چونكە چەند خاڵێك هەيە دەبيتە بەڵگە لەسەر هەندێ ايەكەم : فەرموودەی خوای گەورە ﴿ افلا يتدبرون القــرآن ام علـى قلـوب اقفالها ﴾ واتـە: جا ئايا بير لەقورئان ناكەنـەوە، يـا دڵـو دەرونيـان بەستراوە يابەكليل بەسراوە وەكليل دراوە . كەواتە بيرلێكردنەوە بيری بۆ ناچێ بەبێ ڕاوەستان لەسەر مانا . دووەم : فەرمودەی خوای گەورە ﴿ ولاتكـن مـن الغـافلين ﴾ واتـە بەبێ ئاگايـان مەبە بەڕواڵەتی ئايەتەكەوا دەردەكەوێ قەدەغـە كردنەكە بـۆ ياسـاغ كـردن ( التحريــم ) ە وەئـەو فـەرمودەی پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمويەتی ﴿ لم تنهه صلاته عن الفحشاء لم يزدد من الله الابعـدا ﴾ واتـە هـەر كەسـێ نوێژەكـەی لەشـتی خـراپ قەدەغـەی نـەكا ديـارە ئەوەتـەنيا لـەخوا دوور دەكەوێتەوە ،وەنوێژی بێ ئاگاش قەدەغەی شتی خراپ ناكا هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمويـەتی ﴿ كم من قائم حظه من قيامه التعب والنصب ﴾ واتـە چەند نوێـژ كەر هەيە بەشـی تەنها ماندوو بونە ) ئەوە مەبەستی پێ لەو كەسانەيە واتە : نوێژكەر لەنوێژەكەی تەنها ئەوەندەی بۆ هەيە كەئاگای لەنوێژەكەيە ) (الغـزالی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ وتويەتی نوێـژ كەر گفت و گۆ لەگەڵ خـوا دەكا ، وەكو لەفەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) داهاتوە ، قسەكردن لەگەڵ بـێ ئاگـايی بوون بـەهيچ شێوەيەك پێی ناوترێ گفتو گۆ كردن ( المناجاە )وەگومانی تێدا نی‌يە مەبەست لەقورئان خوێندن و زكر كردن و الحمــد الله ووتـن و سـەناو دوعـاو پاڕانـەوەو لالانـەوە و قسـەكردن و هـەمووی لەگـەڵ خوايـە دەی ئەگـەر دڵ بەپـەردەی بێئاگايی گيرابوو ئەو كاتە لەو گەورايەتی خـوا بێ ئاگـا دەبـی پاشـان باهـەر بۆخۆی زمانی بجولێنی بەحوكمی عادەت ئەوەش زۆر دوورە خـوا گيرای بكا . الغزالی لە (ابی طالب المكــی) وەری گرتـوە ( بشـرالحافی ) وتويـەتی ( هـەر كەس

بەدڵ لەخوا نەترسا ئەوە نوێژ کردنەکە بەفەساد چووە ) لە (الحسن) ڕەحمەتی خوای لێ بێ وتویەتی :هەر نوێژێك دڵئاگای لێنەبوو ئەوە نزیکە سزای خوای بێتە سەری . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿ ان العبد یصلی الصلاة لایکتب له سدسها ولاعشرها انما یکتب للعبد من صلاته ما عقل منها ﴾واتە : بەندە نوێژی دەکا نەشەش یەك نەدەیەکی بۆ نانوسرێ . ئەوەندەی بۆ دەنوسرێ کەلەنوێژی ئاگادار بووە . وەلەلایەنی زمانە وانی یەوە چەند قسەی تێدا هەیە ، یەکێکیان بەدڵ لەخوا ترسان لای ئێمە مەرج نیە بەشەکانی بەڵکو مەرجە بۆ وەرگرتنی نوێژ ، وەمەبەست لەبەشەکان یانی قەزا واجب نیە وەمەبەست لەوەرگرتنی حوکمی پاداشتە وەزاناکان تەنها لەحوکمی پاداشتەوەمەستمان لەم شوێنەنمونە هێناوەیەکی بەر چاوە بۆ تێگەیشتنی بۆ نمونە ئەگەر یەکێك جلکێکت لێبخوازی دوای بەشێوەیەکی جوان بۆت بێنێتەوە دیارە ئەو کەسە لەپەیمانەکەی دەچێتە دەرێ وەشایەنی مەدح کردنە وەئەگەر بەشێوەیەکی ناشیرین جلکەکەی بۆ هێنایەوە لەپەیمانەکەی دەچێتە دەرێ بەڵام دیارە شایەنی زەم کردنە نەك مەدح کردن ، هەرواشە ئەگەر کەسێ خوای بەگەورە زانی لەکاتی جێبەجێ کردنی بەندایەتی ئەوە فەرزەکەی ڕاگرتوە ئەو کەسە شایەنی پاداشتە وەهەر کەسێ سوکایەتی بەنوێژ کرد فەرزەکەی ڕاگرتوە بەرواڵەت بەڵام دیارە شایانی زەم کردنە نەك پاداشت دانەوە . سێیەم : ئێمە قەدەغەی ئەو (الاجماع)ە دەکەین بەڵام زاناکانی زانستی کەلام لەسەر ئەوە ڕێك کەوتون دەڵێن دەبێ نوێژ بەدڵ لەخوا ترسانی تێدا هەبێ وبەڵگەشیان لەسەری ئەوەیە سوجدە بۆ خوا بردن گەورەترین تاعەتە ، بەڵام سوجدە بردن بۆ بتان کوفرە ئەوە لەزانستی خۆیان هەردوو سوجدە بردنەکە وەکو یەکن جا پێویستە ئەو کەسەی فەرمانی پێت داوە لەپێناوی سوجدەت بردوە دەبینی سوجدە بردن هەر سوجدە بردنە بەڵام بۆ خوابردن گوێ ڕایەڵیە وە بۆ غەیری خوا گوناح و کوفرە ، گوتویانە ئەوەش مەبەست و ویستەکەیە . مراد لە ( مەبەست ) کردنی

ئەو كردەوانەيە بۆ ئەو كەسەی بانگی كردووی وەمل كەچ بی بۆیان ، وەئەو كەسەی بانگیشت دەكا ناشیٚ مل كەچی كردنی بۆ پەیدا بیٚ مەگەر بەدڵ ترسان نەبیٚ لەبەر هەندێك لەسەر ئەوە رێك كەوتون بەدڵ لەخوا ترسان پێویستە لەنوێژی . (١)

# بەشێك لەدامە كردن

(دامەكردن بەشێكە لەقومار ) ئەوە بانگدەر بانگی نوێژی عەسریٚ‌دا هێشتا هەندیٚ پیاو هەر خەریكی دامەكردن بوون لەگۆرەپانی مزگەوتیٚ ، نوێژی عەسریٚ تەواو بوو ئەوا ئەو پیاوانە هەر خەریكی دامە كردنیٚ بوون هەتا نوێژی مەغریبیٚ مەلا وتی ئەریٚ برایان نوێژی عەسرێتان كردووە؟ ئاخر واكاتی نوێژی مەغریبیٚ داهات ئەوە هەر تێر دامەكردن نەبوون ! دامەكردنیش جورێكە لەقومار كردن ئەوەش حەرامە یەختیارەك گوتی مامۆستا خۆ دامەكردن حەرام نیە ئەدی مەلای فلان مزگەوتیش دامەی دەكەن ، هەروەكی بی دامەكردن لەغەیبەت كردنی خەڵكی باشترە ( لۆ خۆ پیٚ دەخافرێنین و غەیبەتی كەسیش ناكەین ) مامۆستا وتی ئەو مەلایانەش وەكو ئێوە بیٚ ئاگانە ( ئاخر خۆ بەكریٚ نەگیراینە یادەبی دامە یاغەیبەتیٚ بكەن ) چونكە گەمەكردن هەرهەمووی بیٚ ئاگایی یەلەهەق ، زانا هەیە دەڵیٚ دامەكردن بەشێكە لەشەترەنج ( علی ابن ابی طالب ) فەرموویەتی شەترەنج گەمەی عەجەمەكانە هەرچی قوماری لەسەر بكریٚ ئەوە قومارە(میسر) ە لەلای مالك و هەندیٚ لەزاناكان [٢] لە (ابن عمر)یان پرسی دەربارەی شەترەنج ، (ابن عمر)وتی لەتاولەی خراپترە ( ابو موسی الاشعری ) وتویەتی كەسیٚ شەترەنجی ناكا مەگەر گوناحبار نەبی . لەابو جعفر یان پرسی دەربـــــــارەی شەترەنج كردنیٚ وتی ئێمە وازمان لێهێناوە چونكە هی ئـاگر

(١)تفسير الكبير جزء ٢٣ ص٧٨ ، المؤمن

(٢)تفسير القرطبي المجلد ٣ ص٥٣

پەرستانە لەفەرموودەیەکی درێژ پێغەمبەر (ﷺ) داهاتووە هەر کەسێ گەمەبەتاولەو شەترەنج بکا خوا لەو کەسە توڕەیە ، هەر کەسێ لەلای ئەو کەسە گەمەی بەتاولەو شەترەنجی دەکا دانیشی و تەمەشای بکا ئەوا خوا چاکەکانی ڕەش دەکاتەوە دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی خوای گەورە لێی توڕەیە ، ئاو هەموو قسانە بەڵگەنە لەسەر حەرام بوونی گەمەکەبا قومارکردنیش نەبی (والله اعلم) [1]زاناکان هەمویان لەسەر ئەوە یەکن قومار کردن حەرامە ، بەڵگە ئەگەر بەتەنها لەناو یاریەکان هەر باسی ( المیسر )کراوە ئەوە هەموو یارەیەکانی تر قیاس لەسەر (المیسر)دەکرێن وەدامەکردنیش جۆرێکە لە (المیسر) و(المیسر)یش حەرامە کەواتە دامەکردنیش حەرامە . وەخوای گەورە فەرموویەتی ﴿ویصدکم عن ذکر الله وعن الصلاة ﴾ بەلآم (المیسر) قەدەغەت دەکا لەزکری خواو نوێژ کردن ، دامەکردنیش ئەوها قەدەغەت دەکا لەزیکری خوا ، چونکە زۆر جاران دامەکردن نوقمت دەکا لەلەزەتی بردنەوە بەرگریت دەکا لەوە بێجگە لەئۆین و بردنەوە هیچی ترت بەبڕدانابێ وەبێگومان ئەم حالەتەش حەرامە کەبەرگریت بکا لەزیکرو نوێژ وەئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر حەرام کردنی گەمە بەتاولەو شەترەنج جا لەسەر پارەی یابە خۆرایی بێت چونکە خوا ئارەقی حەرام کردوە ئەویش لەرێزو مانای وی داناوە و فەرمویەتی ﴿ یا ایها الذین آمنوا انما الخمر والمیسر ﴾[2] ... لەئەبو هریرەی وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ﴿ اذا مررتم بهؤلاء الذین یلعبون بهذاه الازلام النردوالشطرنج وما کان من اللهو فلا سلموا علیهم فاتهم اذا اجتمعوا اواکبو علیها جائهم الشیطان بجنوده فاحدق بهم کلما ذهب واحد منهم بصرف بصره عنها لکزه الشیطان بجنوده فلا یزالون یلعبون حتی یتفرقوا کالکلاب اجتمعت علی جیفة فاکلت منها حتی ملأت بطونها تفرقت ولانهم یکذبون علیها فیقولون شاه مات ﴾

(1)تفسیر القرطبی سورة یونس / ٣٢

(٢)المائدة /٩

(٣)کتاب الکبائر

واته : ئەگەر بەلای ئەو کەسانە ڕەت بوون گەمەی بە (ازلام)و تاولەو شەترەنج و هەرچی گەمەو یارەیەکی تر هەیە دەکەن سەلامیان لێمەکەن ئەگەر لەسەر یاری بەکە کۆدەبنەوە یاسەریان بەسەردا شۆر دەکەنەوە شەیطان بەخۆیو سەربازەکانیەوە دێ دەو رەیان دەدا هەریەکێك لەو کەسانە ڕۆیی تەماشای دەکا شەیطان بەسەربازەکانی مشتە کۆلمیەکیان دەخێوێنێت بەردەاوم یاری دەکەن هەتا بلاوەی لێدەکەن وەکو سەگەکانی سەر کەلاکی ، هەر یەکێکیان هەتا تێری لێ دەخوا دوایی دەڕوا ، ئەو یاری کەرانەش ئەوها نەوەکو سەگەکان تا تێردامە دەبن ئەنجا دەڕۆن درۆش دەکەن و دەڵێن (شامرد)هەر لەپێغەمبەر (ﷺ) ڕیوایەت کراوە ﴿ اشد الناس حسابا یوم القیامة صاحب الشاه یعنی صاحب الشطرنج الاتراه یقول قتلته والله مات والله افتر وکذب علی الله ﴾ واتە : ئەو کەسی شەترەنجی دەکا توندترین لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکا ئایا نابینی دەڵی کوشتم وەلاهی مرد ، وتنی وشەی وەلاهی مرد درۆو بوختانە لەسەر خوا .[٣]بەلێ زۆربەی زاناکان دەڵێن یاری بەشەترەنج کردن حەرامە لەسەر شت بێ یا بەخۆڕاییبەلام ئەگەر لەسەر شت بوو ئەوە بەبێ ترس حەرامە وەئەگەر لەسەر شتیش نەبوو دیسان هەر حەرامە لای زۆربەی زاناکان . وە لە (الشافعی) دەگێرنەوە ڕێی بەشەترەنج داوە ئەگەر لە سەر هیچ نەبێ وە خەریکت نەکا لە واجبات و نوێژ کردن لە کاتی خۆی . لە (النووی) یان پرسی دەربارەی شەترەنج کردن حەرامە یان نا وەلامی داوە ووتی لای زۆربەی زاناکان حەرامە ، وە هەر دیسان لێیان پرسییەرە ئەدی جائیزە یانا بۆ ئەو کەسانەی دەیکەن گوناحباردەبن یانا ووتی ئەگەر نوێژی پێ لەکاتی خۆی بفەوتێ یا لەسەر شت بێ بەلێ ئەوە حەرامە وە ئەگەر نا ئەوە هیچ شەترەنج کردن لای امامی شافعی ناپەسندە (مکروە) . وەلای غەیری ئەو حەرامە ئەوە قسەی (النووی) یە لە فەتوایەکانی داویەتی .

—

# بەشێك لە ڕوونكردنەوەی سوێند خواردن

لە (عبد الله بن عمر) وتی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە (عومەری كوڕی خەتاب) بەسواری دەڕۆیی و سوێندی بەسەری باوكی دەخوارد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە قەدەغەی كردووە لەوەی سوێند بەسەری باوكتان بخۆن ، جا هەركەسێ سوێندی خوارد با سوێند بەخوا بخوا یا ئەوەتە بێ دەنگ بێ . (عكرمة) ووتی (عمر) ووتی قسەم بۆ كۆمەڵە خەڵكەكی دەكرد ووتم نا بەسەری باوكم پیاوێك لە دواوە ڕا ووتی سوێند بەسەری باوكتان مەخۆن كە ئاوڕم دایەوە دیتم پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو ئەگەر یەكێكتان سوێند بە (مەسیح) بخوا لە ناو دەچی كە (مەسیح) یش لە باوكتان چاكترە ، ئەگەر سوێند بەشتەكی بخۆن دیارە ئەو شتە بەگەورە دەزانی ، لە ڕاستی دا گەورایەتی تەنیا هەر بۆ خوایە . (ابن عمر) گوێی لە پیاوەكی بوو قسەی دەكرد دەیوت (نا بەكەعبەی) (ابن عمر) ووتی سوێند بەغەیری خوا مەخۆ گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو ﴿ من حلف بغیر الله فقد كفر أو اشرك ﴾[1] واتە هەر كەسێ سوێند بەغەیری خوا بخوا ئەو كەسە كافر بووە یا هاوبەش پەیدا كەرە . بە ڕواڵەتی فەرموودەكە وا دیارە دیاری كردنی سوێند بەخوا خواردن تایبەتە ، بەڵام شەرع زانەكان ڕێكن لەسەر ئەوەی سوێند خواردن بە خواو بەزاتی خواو بە سیفەتەكانی خوا دادەمەزرێ . بەڵێ هەندێ لە زانایەكانی حەنبەلی سوێند خواردنیان بە پێغەمبەر (ﷺ) جیا كرۆتەوە ووتویانە سوێند خواردن بە پێغەمبەریش دادەمەزرێ ، ئەگەر سوێندەكەی شكاند پێویستە كەفارەتی بدا ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)یەكێكە لە ڕوكنەكانی شایەتی دان كە بەبێ ئەو تەواو نابی ، جا ئەو قسەیە نابێتە بەڵگەو نەپێویستی ئەوەش دەكا سوێندی پێ دانامەزرێ ، بەڵكو هەر جائیز نیە سوێندی پێ بخورێ نەخوازە لا لە گەڵ ڕاستی ئەو قەدەغە كردنە سەریحەی پێغەمبەر (ﷺ) ناگونجێ شرح الزرقانی علی

موطأ مالك مجلد ٣ ص١٧ كه قەدەغەی سوێند خواردنی بە غەیری خوا کردووە . بەڵێ خوای گەورە سوێند دەخوا بە دروست کراوەکانی خۆی چۆنی بیەوێ وەکو سوێند خواردن بە شەو و ڕۆژ هەتا بەدیهێنراوەکانی سەریان سوڕ بمێنێ و بزانن هێزو دەسەلأتی خوا چەند گەورەیە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا دروستی کردونە بەلأم مرۆڤ دەبێ تەنیا سوێند بە خواو بخوا هەروەکو وتراوە بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە (عمر) ووتی سوێندم بە خوا نەخواردوە لەو ڕۆژەی گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) قەت سوێندم بەسەری باوکم نەخواردوە نە بەڕاست و نەبەدرۆ [1] . بەو شێوەی ڕوون بۆوە کەوا دروست نییە سوێند خواردن بە غەیری خوا . بەلأم ئەمڕۆ دەبینی لە هەر کوێ پیاوێ ناو بانگی دەرکردبی بەباشی ، جا وابی یاوەنەبی ئەو پیاوە مردو بی یا زیندووبی ئەوە خەڵکی ئەو شوێنە سوێند بەسەری دەخۆن یابەگۆڕەکەی بە پیرۆزی دەزانن بۆ نمونە لە پارێزگاری سلێمانی سوێند بەسەری کاکە احمدی شێخ دەخۆن یا بەگۆڕەکەی لە پارێزگاری هەولێر سوێند بە عبد القادری گەیلانی و هیتر دەخۆن لە ناوچەی بادینان سوێند بەشێخ نور الدین بریفکانی دەخۆن ئێمەش دەڵێین بەهیچ شێوەیەك دروست نییە سوێند خواردن بەسەر یابەگۆری ئەو زاتانە نەبەسەری باوك و باپیریشتان ، جا ئەگەر سوێندیان پێ دەخۆن و باوەڕیشیان پێ ئەوە سوێند خواردن بە غەیری خوا دەبێتە هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا .

## بەشێك لە سەلاوات لێدان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ یاایها الذین آمنوا صلوا علیه وسلموا تسلیما﴾ [2] واتە : ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ئێوەش درودی بۆ بنێرن و سەلأواتی لەسەر لێ بدەن . (مالك) ڕیوایەتی کردوە لە (ابی مسعود الانصاری) ووتی پێغەمبەر (ﷺ)

(١) شرح الزرقانی علی موطأ مالك المجلد ٣ ص٦٨

(٢) الاحزاب / ٥٦

هاته لامان ئێمەش لە مزگەوتی (سعد ابی عبادة) بوین (بشير بن سـعد) پـێی ووت ئەی پێغەمبەر خوا فەرمانی پـێ داوین سەلاواتت لەسەر لێ بدەیـن ئێمـه چـۆن سەلاواتت لەسـەر لێ بدەیـن ؟ ووتـی پێغەمبـەر (ﷺ) تـاوێك بـێ دەنـگ بـوو هـەتا ووتمان خۆزگە ئەو پرسیارەمان لێ نەکردبایـە : لـە دوای فـەرمووی بڵێـن ﴿ اللهم صل علی محمد وعلی آل محمد كما صليت علی ابراهيم وبـارك علـی محمـد وعلـی آل محمد كما باركت علی ابراهيم في العالمين انك حميـد مجيـد والسلام كمـا علمتـهم ﴾ واتـە : ئـەی خودایـە ڕەحمـەتی خـۆت بڕژێنـە سـەر موحـمـەدو کـەس و کـاری موحەمەد هەروەکو چۆن ڕحمەتی خۆت دارژاند بووە سەر ئیبراهیم وەبەرەکەت بڕژێنە سەر موحەمەدو کەس و کاری موحەمەد وەکو چۆن بەرەکەتت داڕژاندبوە سەر ابراهیـم و کەس و کاری ئیبراهیم لـە هـەموو عالـەمدا هـەر ئـەتۆ سـوپاس کراوو گەورەی ، وەسەلام بدەنەوە چۆن فێر بوونە . لە (كلحة)ش وا ڕیوایەت کراوە بەڵام (في العالمين) تێدا نیە وە بیروڕای جیا جیا هەیە دەربارەی سەلاوات لێدان لەسـەر پێغەمبـەر (ﷺ)پێویسـتە یانـا ، هـەندێکیان دەڵێـن پێویسـتە بـە گوێرەی ئەو فەرموودەیە ﴿ من ذكرت عنده فلـم يصـل علـی فدخـل النـار﴾ واتـە : ناوم لای هەر کەسێ هات و سەلاواتی لەسەرم لێ نەدا ئەوە دەچێتە ناو ئاگری . وە لـە گەورایـەتی سـەلاوات لێـدان لەسـەر پێغەمبـەر (ﷺ) لێی چەسـپاوە کـە فەرموویەتی ﴿ من صلی علی صلی الله عليـه بها عشرا ﴾ واتـە : هـەر کەسـێ یـەك سەلەواتم لەسەر لێ بدا خوا دە سەلاواتی لەسەر لێدەدا . (سهل بـن عبـــد الله) ووتویەتی سەلاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە بەندایەتی کردن گەورەترە چونکە خوا بە خۆی و فریشتەکانی سەلاوات لـە پێغەمبەری دەدەن لە دوایـی فـەرمانی بـەبڕوادارەکان کـردوە سـەلاوات لەسـەر پێغەمبـەر لێ بـدەن ، بـەڵام بەندایەتی یەکانی تر وەها نینە . لە (سعيد بن المسيب) ڕیوایـەتی کراوە لـە (عمر بـن الخطـاب) ووتویـەتی پاڕانەوە لـە خوا لە ئاسمان گیردەبێ سەلاوات لەسـەر پێغەمبەر (ﷺ) لێ دەدرێ هەر کاتێ سەلاوات لێدرا پاڕانەوەکە بەرز دەبێتـەوە .

پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی ( من صلی علی في کتاب لم تزل الملائکة یصلون مادام اسمي من ذلك الکتاب ) (١) هەر کەسێ لە کتابەك سەلاواتم لەسەر لێبدا بەردەوام فریشتەکان سەلاواتی لەسەر لێدەدەن هەتا ناوم لەو کتێبەی مابێ

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (من صلی علی في کتاب لم تزل الملائکة یصلون علیه مادام اسمي من ذلك الکتاب )(١) واتە هە کەسێ لە کتابەك سەلاواتم لەسەر لێبدا بەردەوام فریشتەکان سەلاواتی لەسەر لێدەدەن هەتا ناوم لەو کتێبەی مابێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە دوو ملائیکەتی بۆ تەرخان کردووم کە لای هەر موسلمانێك ناوم بهێنرێ وسەلاوەتم لەسەر لێ بدا دەڵێن خوا لێت خۆش بێت خوای گەورەش لە وەڵامی دوعای ئەودوو مەلائیکەتە دەفەرمووی ( ئامین ) وە لەلای هەر بەندەیەکی موسڵمان ناوم بهێنرێت و سەلاوەتم لەسەر لێنەدا ئەو دوو ملائیکەتە دەڵێن خوا لێت خۆش نەبێت خوای گەورەش لە وەڵامیان دا دەفەرموێت ( ئامین)

## بەشێك قورئان وەکو میزانە بۆمان

قورئان و فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەردووکیان وەکو میزان وانە بۆمان پێویستە لە سەرمان گفتارو کردارمان بەو دووە بکێشین ، وە هەر کەسێ گفتارو کرداری پێ نەکێشێ پەشیمان دەبێتەوە و حەسرەت هەڵدەکێشێ باوەکو هەندێ کردەوەی هەقیشی هەبێ و هەندێکی باتل بی وە هەندێکی هاویەش پەیدا کردن بی وەهەندێکی کوفربی (نعوذ بالله) خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ لیبلوکم ایکم احسن عملا وهو العزیز الغفور ﴾ . واتە : تا تاقیتان بکاتەوە کە کامە لە ئێوە بەکردەوە باشترە وە هەر ئەویشە بەدەسەڵات و لێخۆش بوو . دەبێ کردەوە بە دڵسۆزی بکرێ و ڕاست و دروست بێ ، ئەگەر کردەوەکە بە دڵسۆزی بوو بەڵام ڕاست و دروست نەبوو لێی وەرناگیرێ ، هەروەها ئەگەر کردەوە ڕاست و دروست بوو بەڵام بە دڵسۆزی نەبوو هەر لێی وەر ناگیرێ جا کردەوەی بە دڵسۆزی ئەوەیە بە پاکی بۆ خوابێ‌وە کردە . وەی ڕاست و دروستیش ئەوەیە لەسەر سونەت بێ . وە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وما لاحد عنده من نعمة تجزی الابتغاء وجه ربه الاعلی ولسوف یرضی ﴾ واتە : وە بۆ هیچ کەس نیعمەتێك نیە تا بیەوێ پاداش بدرێتەوە مەگەر خۆشنودی پەروەدگاری بەرزی خۆی وە لە دوای خۆشنود نەبێ . چۆن قورئان هاتۆتە خوارەوە بۆ ترساندنی کافرەکان و ئامۆژگاری کردنی بڕواداران ، دروست نیە لەوە لای دەی کە بۆی

(١)تفسیر القرطبی مجلد ١٤ ص٢٣٥

(٢) سورة الاعراف الآیة ٣ تفسیر الصاوی علی الجلالین مجلد ٢ ص٦٣

هاتۆتـه خـوارەوە ، بـۆ نمونـه وەكـو ئـەو كەسـانەی لـه ڕێگـاو بانـەكان قورئـان دەخوێنن ، یا ئەوەتـه گۆرانـی پـێ دەڵێـن مەبەسـتیان پـێ دونیایـه یـا لـەزەت پـێ وەرگرتنـه كه قورئـان بـه دەنگـی خـۆش وەكـو گۆرانـی دەڵێـن ئـەوە گومرایـیەكی ئاشكرایه و پێویستیبه سزا هـاتن دەكا [٢] . یـان قورئـان لـه تازیـان دەخوێنـن بەرامبەر هەندێ پارە وپول ئەوەش حەرامە وەكو احمدی كوڕی حنبل و هـەندێ زانـای تروتویانـه ، وە ئەگـەر خوێنـدن نوێژكـەر نوێژەكـەی لێ تێـك بچـێ ئـەوەش حەرامە . (نەوەوی) وتویەتی : بە زۆربەی خەڵكی فریو مـەخۆو مەخلـەتێ ئەوە كاری نەفامه قورئانی لەسەر جەنازەی دەخوێنن به تـه مطیـط و دەر كردنـی وتـه لە شوێنی خۆی ئـەوەش بەكۆی دەنگـی زاناكـان حەرامـه [١] . (النسـائی) لـه ابـی (سعید الخدری) ڕیوایەت كردوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ من شر الناس رجلا فاسقا یقرأ القرآن لا یرعوی الی شئ منـه ﴾ واتـه : خراپـترین كـەس فاسقه قورئـان بخوێنـی و چـاودێری قورئـان خوێندنەكـەی نـەكا ، مەبەسـتی پێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەیه كه كاری پێ نەكەن هەروەكو ڕونمان كردوە خوای گـەورە فەرموویـەتی ﴿ واتبعوا احسن ما انزل الیكم من ربكم ﴾ واتـه : خـوای گـەروە فـەرمانی پـێ كردویـن پەیڕەوی لە قورئان بكەین وە بەچی فەرمانمان پێ دەدا وا كاری پێ بكەین بـەلام بەداخەوە ئێمە وازمان لێهێناوە چۆن جولەكەكان و گاورەكـان وازیـان لێهێناوە ، هـەندێ كـەس مـاون كتـاب و قورئانیـان لا مـاوە بـەلأم هیـچ سـوودی نیـه لـه بـەر زۆربـەی نـەفامان و ئـەو كەسـانەی كەوتونـه دوای هــەواو هەوەسـیان وە ئـەو فەرموودەیه دەڵێ ﴿ ان هذا القرآن شافع مشفع من اتبعه قاده الی الجنة ومـن تركـه أو اعـرض عنـه زُجَّ فـی قفـاه الی النـار ﴾ واتـه : ئـەو قورئانـەی تكـا دەكـاو خـوا تكاكـەی لێ وەردەگری هــەر كەسـێ پـەیرەوی لێ بكـا دەیباتـه بەهەشـت وە هــەر كەسێكیش وازی لێ بێنـی یـا ڕووی لێ وەرگێڕی لـه لـەدوایدا فـڕەی دەداتـه نـاو ئاگری . خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ كتاب انزلناه مبارك لیدبروا آیاته ولیتذكر اولـو الالبـاب ﴾ واتـه : بەڵگـەیە لەسـەر هـەندێ كه پێویسـتە مانـای قورئـان بزانـی ، وە

بەڵگەشە لەسەر هەندێ کە قورئان بە تەرتیل بخوێنی چاکترە لەوەی تێنەگەی چونکە دروست نابێ تێفکری هەتا لێی تێ نەگەی [٢] . (ابو سعید الخـدری) دەڵێ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو ﴿ ویقرأ القرآن ثلاث مؤمن و منـافق وفاجر وقال بشیر قلت لولید ما هؤلاء الثلاثة قال المؤمن به و المنافق کافر بـه و الفـاجر یتاکل به ﴾ [٣] لە پێشەوە کراوەتە کوردی . پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی ﴿ انـی اخاف علی امتی اثنتین القرآن و الـین ، امـا اللـین فیتبعـون الزیـف ویتبعـون الشـهوات ویترکون الصلاة واما القرآن فیعلمه المنافقون فیجادلون بـه المؤمـن ﴾ واتـە : ( مـن لـە دوو شتان لـە ئۆممەتەکەم دەترسم لـە قورئـان و (اللـین) مانـای (اللـین) ئەوەیـە یانی بە دوای شتی ساختەوە دەکەون ، دەکەونـە دوای هـەواو هـەوەس و واز لـە نوێژکردن دێنن وە قورئانیش مرۆڤی دوو ڕوو فێری دەبن و دەمە دەمی پـێ لـە گەڵ بڕواداران دەکەن .

( **سودێك** )

پێشەوا (ابـو الفضـل الـرازی) ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ وەری گرتـوە کـەوا پێنـج مەسەلە هەیە پێویستە لەسەر قورئان خوێن بیان زانی.

١- ئەگەر گومانی لە پیتێك بوو نەیزانی هـەمزە دارە یـا بـێ هـەمزە دارە یـا بـێ هەمزەیە ، ئەگەر وازی لە هەمزەکەی هێنا لـە هـەموو قورئانێ ئاوازی نـابێ وە ئەگەر کردیە هەمزە و هەمزەدار نەبوو ئاوازی دەبێ .

٢- ئەگەر گومانی لە پیتێك بوو ئایا بە (یا) یابە (تـا) دەخوێندرێتەوە ئەوە بە (یا) بخوێنێتەوە چونکە قورئانی پیرۆز (مذکـرة) ٣- ئەگـەر کەسـێ گومـانی لـە پیتێك بوو نـەیزانی ئایـا (مقطـوع) ە یـا (موصـول) ە یـا بـە(الـف)ی وەصڵـی بخوێنێتەوە چونکە هەموو (مقطوع) ەکەی لە قورئـان بە (الوصل) خوێندەوە

(١)فقه السنة المجلد ١ ص٥٣٩

(٢) تفسیر القرطبی المجلد ١٥ ص١٩٣

(٣) رواه احمد عن عبد الرحمن المقری

ئاوازی نابیٰ وه ئهگهر (قطع) ی به (الوصل) خوێندهوه ئاوازی دهبیٰ .
٤- ئهگهر کهسیٰ گومانی له پیتێك بوو نهیزانی ئایا (ممدود) یا (مقصور) ه یا به (الف) ی (القصر)بخوێنێتهوه ئهگهر (قصر) ی ههموو (ممدود) هکهی کرد له قورئانیٰ ئاوازی نابیٰ وه ئهگهر (مد) ی کرده (مقصور) ئاوازی دهبیٰ ٥- وه ئهگهر کهسیٰ له پیتێك گومانی بوو نهیزانی ئایا (الف)ه که (مفتوح) ه یا (مکسور) ه یابه (الفتح) بخوێنێتهوه چونکه ئهگهر ههموو (مکسور)هکی کرده (فتح) ه له قورئانیٰ ئاوازی نابیٰ ، وهئهگهر (کسر)هی (مفتوح)کرد ئاوازی دهبی ، جا بازنهی قورئان له ئهو پێنج پیتهیه [1] . وه ئهو کهسانهی دهڵێن پاداشتی قورئان به مردووی دهگا ئهوه چهند مهرجێکیان داناوهو دهڵێن : نابی قورئان خوێنهکهی له سهر قورئان خوێندنهکهی کرێی وهربگری چونکه ئهگهر قورئان خوێن لهسهر قورئان خوێنهکهی کرێی وهرگرت ئهوه حهرامه لهسهر پاره دهری و پاره وهرگری وه هیچ پاداشتی قورئان خوێندنهکهی بۆ نیه چونکه (احمد) و (الطبرانی) و (البیهقی) له (عبد الرحمان بن شبل) له پێغهمبهر (ﷺ) ریوایهتی کردوه فهرموویهتی ﴿ اقرؤا القرآن و اعلموا ولا تجفوا عنه ولا تغفلوا فيه ولا تستكثروا به ﴾[2] له پێشهوه کراوهته کوردی . وه خوای گهوره فهرموویهتی ﴿ وان ليس للانسان الا ماسعى ﴾ واته : چۆن هیچ کهس ناتوانیٰ گوناهی یهکیتر ههڵگریٰ ههر ئهوهاش مرۆڤ بێجگه له کردهوهی باشی خۆی هیچی تری بۆ نییه . ئیمامی شافیعی و چهند کهسێکی تر لهم ئایهته وهریان گرتووه که خێرو پاداشتی فاتیحه و قورئان خوێندن ناگات به مردوان چونکه له کردهوهی خۆیان نییه ، لهبهر ئهوهیشه که پێغهمبهر (ﷺ) فهرمانی نهداوه بهوهو رێنمونی کهسی نهکرد بۆی بههیچ جۆرێك نهبیستراوه که هیچ کهس له یارهکانی پێغهمبهر (ﷺ)شتی وایان کردبیٰ ، ئهگهر ئهوه سوودی ببوایه و چاکه بوایه ئهوان له پێش ئێمهوه ئهیان

(١)حاشية البيرجمي على الخطيب المجلد ٢ ص٢٠

(٢) فقه السنة ص٥٦٩

کرد ، ئەو کردەوەیانەی کە مەبەست پیّیان پەیوەندی و نزیك بوونەوەیە لە خوا ئەوە بە عەقل بازی نابیّ ، بەڵکو ئەبیّ بەرێکی فەرمانی خوایان پێغەمبەری لەسەر بیّ بەڵیّ دوعاو خێرو سەدەقە ئەگات بەو کەسەی کە بۆی ڕەوانە ئەکریّ ئەمیش بەپێی بڕیاری هەموو پێشەوایان و حەدیسیشی لەسەرە ، وە ئەو فەرموودەی ئیمامی موسلیم لە سەحیحەکەی خۆی ڕیوایەتی کردوە لە (ابوهریرة)ی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ اذا مات الانسان انقطع عمله الا فی ثلاث من ولد صالح یدعو له او صدقة جاریة من بعده او علم ینتفع به ﴾ واتە : کاتیّ مرۆڤ مرد کردەوەکانی دەبڕیّ مەگەر لە سیّ ڕێگەوە نەبیّ ، کوڕێکی باشی هەبیّ دوعای بۆ بکا یا سەدەقەیەکی بەردەوام لە دوای خۆی بەێنیّ یا زانستێك خەڵك سوودی لیّ وەرگرن . ئەم سیّ شتەش لە ڕاستیدا هەر لە کردەوەی خۆی ئەژمێریّ (٣)

# بەشێك لەمافەکانی دایك و باوك

خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ وقضی ربك الاتعبدوا الا ایاه وبالوالدین احسانا اما یبلغن عندك الکبر احدهما او کلاهما .. .. الی آخر الآیة ﴾ واتە : وەپەروەردگارت فەرمانی داوە کەبێجگە لەو نەپەرستن ، لەگەل دایك و باوکتان چاکە بکەن ئەگەر یەکێك لەوان یان هەردوکیان لای تۆ پیر بوون قسەی سوکیان پیّ مەڵیّ تەنانەت ئۆفیش مەڵیّ بزانە کاتیّ خوا باسی ئەو ڕستەی کرد داوای لەمرۆڤ کردووە دەرهەق مافی دایك و باوکی باش بی بەپێنج شتان . یەکەم :. فەرموودەی خوا لەم بڕە ئایەتە ﴿ فلا تقل لهما اف ﴾ واتە تەنانەت ئۆفیش مەڵیّ دووەم لەو بڕە ئایەتە فەرموویەتی ﴿ ولا تنهرهما﴾ واتە : بەسەر یاندا مەنەڕێنە سیّیەم : لەو بڕە ئایەتە فەرمەویەتی ﴿ وقل لهما قولا کریما ﴾واتە : قسەی جوانیان لەگەڵدا بکە چوارەم :. لەو بڕە ئایەتە فەرموویەتی ﴿ وخفض لهما جناح الذل من الرحمة﴾

(٣) تفسیر الکبیر ص ٢٥٨

واتــه : بـاڵی خـۆ بەکـەم زانینیـان بـۆ بێنــه خــوارێ پێنجـەم لــەو بــره ئایەتــه فەرموویەتی ﴿ وقل رب ارحمهما کما ربیانی صغیرا ﴾ واتە : بڵێ ئەی پـەروەردگارم هەروەکو بەزەییان بەمندا هاتەوە بەمنداڵی تۆیش بەزەیت پێیان دابێتـەوە .. وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ رضی الله فی رضا الوالدین وسـخطه فـی سـخطهما ﴾ واتە ڕەزامەندی خوا لەسەر ڕەزامەندی دایك و باوکە ، وەتوڕەیـی خـواش لەسـەر تـوڕە بوونـی دایك و باوکە . وەرِیوایەت کراوە ئەو کەسە چاکە لەگەڵ دایـك و باوکی دەکا هەرچی دەکا بابیکا قەت ناچێتە نـاو ئاگری وەئەوکەسـەش خراپە لەگەڵ دایك و باوکی دەکا هـەر چـی دەکا بابیکا قـەت ناچێتـە نـاو بەهەشـتێ وە هـەر دیسـان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویـەتی ﴿ ایـاکم وعقـوق الوالدیـــن فـــان الجنـــة یوجدریحها من مسیرة الف عام ولایجد ریحها عاق ﴾[1]واتە لەئازار دانـی دایـك وبـاوك بترسن چونی بەهەشت بۆنـی هـەزار ساڵە ڕێ دەڕوا ئـەو کەسـەی دایـك و بـاوکی ئازار دەدا تەنانەت بۆنی بەهەشتیش ناکا لە (عبدالله بن عمـر و بـن العـاص ) وتـی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿ رضا الرب فی رضا الوالدیـن وسـخط الـرب فـی سـخط الوالدین ﴾[2]لەپێشەوە کراوەتە کوردی لە( عبدالله بـن مسـعود )وتـی لەپێغەمبـەرم (ﷺ) پرسـی ﴿ ای الاعمال احب الی الله تعالی قال الصلاة لوقتها قلت ثـم ای قـال بـر الوالدین قلت ثم ای قـال الجـهاد فـی سبیل الله تعـالی ﴾[3]واتـه : چـی کردەوەیـەك لـەلای خـوا لەهـەموو شـت خۆشەویسترە فـەرموی نوێـژ کـردن لـەکاتی خـۆی وتم ئـەی دوای نوێـژ فـەرمووی چاکـەکردن لەگـەڵ دایـك و بـاوك وتم ئـەی دوای وتـی جیهاد کردن لەڕێگای خوا . بەڵام بەداخەوە لەو زەمانەی زۆر کوڕ هەیە بەئـەرکی سـەر شـانی خۆیـان هەڵناسـتن بەرامبـەر بەمافی دایـك و باوکیـان لەسـەریان بـەو جۆرەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردون ،بەڵکو سنوری خوا دەبەزێنن وقسەی

(١)تفسیر المدارك

(٢)اخرجه الترمذی

(٣)تفسیر الخازن

ناشیرنیان دەرهەق دەکەن ولەسەر شتەکی هیچ لێیان دەدەن و لەماڵی دەریان دەکەن ، دیارە ئەو کوڕانە لەبیری‌یان دەچی چی‌ڕۆژەك چاوەڕوانیان دەکا ئەوانیش کەپیر بوون لەدونیا یالەڕۆژی زیندوو بونەوە لەگۆر کەلەبەردەست خوای گەورە ڕادەوەستن (سودێك) قسەی بەئەنقەست لەناو نوێژێ ، نوێژی پێ بەتاڵ دەبێتەوە لەنێو ئەو قسانەدا تەنها وەڵامدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) جیا دەکرێتەوە ، جابانگی هەرکەسی کرد دەبێ وەڵامی بداتەوە یالەدوای مردنیش بێ‌یابەپێچەوانەوە ، هەندێ لەزاناکان ئەو وەڵامدانەوە دەبەستنەوە (التقید)دەکەن بەبانگ کردنی لەکاتی ژیانی چونکە پێویستە وەڵامی پێغەمبەر(ﷺ) بدرێتەوەو نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە ، وەوەڵامدانەوەی دایك و باوك لە نوێژی فەرز یاساغە ، چونکە برینی نوێژ حەرامە بەڵام لەنوێژ کردنی سونەت وەڵامدانەوەیان دروستە نەخوازە لا ئەگەر وەڵام نەدانەوەیان لەسەر دڵ و دەرونیان گران بوو ، ئەوە لەوکاتە باشتر وایە وەڵامیان بدرێتەوە بەڵام نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ( ئەگەر فەرز بوو) بوخاری لە (الادب المفرد)لە (ابن عباس)وتویەتی ﴿ مامن مسلم له والدان مسلمان يصبح اليهما محتسبا الافتح الله له بابين من الجنة ) وان كان واحد فواحد وان غضب احدهما لم يرض الله عنه حتى يرضى عنه ، قيل وان ظلماه ؟ قال وان ظلماه ﴾ واتە هیچ موسلمانێك نیە دایك وباوکی هەردوکیان ما بن و موسڵمان بن وەلەبەر پاداشتی لای خوا لەگەڵیان باش بی ( ئیلا )خوای گەورە دوو دەرگای بەهەشتی لێ دەکاتەوە ئەگەر تەنیا باوکی یا دایکی مابی ئەوە یەك دەرگای لێ دەبیتەوە ، ئەمجارە ئەگەر یەکێکیان لێی ناڕازی بوو خواش لێی ڕازی نابی هەتا لێی ڕازی دەبی ، ووتیان ئەگەر دایك و باوکی ستەمیشیان لەو کوڕەکرد ؟ وتی بەڵێ ئەگەر ستەمیشیان لێ کرد . ( ابو داود ) و (ابن ماجه ) لە(مالك بن ربيعة ) ڕیوایەتیان کردووە ووتی ﴿ بينما نحن عند رسول الله (ﷺ) اذ جاءه رجل من بني سلمة ، فقال يارسول هل بقي على من برأبوي شئ ابرهما به بعد وفاتهما ؟ قال نعم الصلاة عليهما ، والاستغفار لهما ، وانفاذ

عهدهما واكرام صديقهما وصلة الرحم التي لاتوصل الا بهما ﴾ واته : كاتـەكێ ئێمـە لای پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوین پیاوێکی ( بنـی سلمة ) هات وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەدوای مردنی دایك و باوك هیچ چاکەیەکیان لەسەرم دەمێنێ بۆیان بکەم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویبەڵێ دوعایان بۆ بکەوداوای لێخۆشبونیان بۆ لەخوا بکەو پەیمانیان بەجێ بێنە و ڕێزی هاورێکانیان بگرەو پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنە کەبەجێ نایە مەگەر بەوان نەبێ . ئەوە عبدالله کوڕی عومەری کوڕی خەتابە نمونەی کوڕی چاکمان بۆ دێنێتەوە ،وەعبدالله ی کوڕی دینار ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە وەهەروەکو موسلم لەسەحیحی خۆی ڕیوایەتی کردوە ( عبدالله ی کوڕی عومەر لەڕێگا توشی پیاوەکی دەشتەکی هات عبدالله سەلامی لێکرد و سواری وڵاغەکەی خۆی کردوو چەفیەکەشی لەسەر کردەوە بەوی دا ( ابن دینار)وتی‌وتمان ئەی عبدالله خوا چاکەت لەگەڵ دا بکا ئەو پیاوە دەشتەکی‌یە بەکەمەکی ڕازی بوو عبدالله وتی باوکی ئەو پیاوەی خۆشەویستی عومەری باوکم بوو من گوێم لەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمو ﴿ ان ابر البر صله الرجل احب مع ابيه ﴾ واته : چاکترین چاکە سیلەی ڕەحمە لەگەڵ پیاوێك بەجێ بێنێ کەلەگەڵ باوکت یەکیان خۆش ویستبێ) هەروەکو لە (جمع الزوائد)داهاتووە لەدنس پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿ فی البر ان تصل صديق ابيك ﴾[1] واته : سیلەی ڕەحم لەگەڵ هاوڕێی باوکیشت بەجێ بێنی هەر چاکەیە

# بەشێك لەحەج کردن

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ أن اول البيت وضع للناس للذی ببکة مبارکا وهدی للعالمين فيه آيات بينات مقام ابراهيم ومن دخله کان آمنا ﴾[1] بەڕاستی یەکەم خانویەك کەبۆ خەڵك داندراوە مەکەیەکە پڕپیت و بەرەکەت بی هۆی هیدایەت وڕێنیونیی جیهانیانە نیشانە گەلێ تێدایە مەقامی ابـــــراهیم ، وەهەر کەس

(۱)تربية الاولاد فی الاسلام / عبدالل ناصح علوان ج

بچێتە ناوی ئەمین دەبی وەمانای ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ﴿ من حج فلم يرفث ولم يفسق خرج من ذنوبه كيوم ولدته امه والحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة ﴾ واتە : هەر کەسێ حەجی کردو نەچووە لای ئافرەت و گوناحی نەکرد لەگوناح پاك دەبێتەوە وەکو ئەو رۆژەی لەدایك بووە. وەحەجی وەرگیراو پاداشتەکەی مەگەر بەهەشتە ئاگاداری پێویستە پێش دەست بەحەج کردن دەبێت وریای خۆت بی نەوەکو توشی هەندێ شت بی کەنەفامەکان دەیکەن ، یاگومڕایەکان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن ، زۆر کەسمان دیوە کەکەوتونەتە ناو هاوبەش پیدا کردن وەکو بەهاناوە هاتن لەغەیری خواو داوای یارمەتی کردن لەپێغەمبەر ، پیاو چاکان و مردوەکان کەداوایان لێ دەکەن و سوێندیان پێ دەخۆن لەبەر ئەوە بەگەورەیان دەزانن بەو جۆرەی داوای حەج کردنیان لێ دەکەن وەخوای گەورە فەرموویەتی ﴿ لئن اشركت ليحبطن عملك ﴾[٢] واتە : ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی کردەوەن نابود ئەبێ . (الحسن ) فەرمویەتی ( الحج المبرور)حەجی وەرگیراو بریتیە لەوەی بگەرێیەوە ئومێدت بەدونیا نەمێنێ و بەتەمای ڕۆژی دوایی بیت ، ئەگەر یەکێك ویستی حەج بکا ئەوە لەسەریەتی فێری چۆنیەتی حەج کردن بی چونکە زانینی فەرزەو ولەسەر هەموو یەکێك پیویستە یانی ( فرض العين) ەچونکە بەندایەتی کردن دورست نیە ئەگەر نەیزانی ، ئەگەر یەکێك کەموو کوری هەبوو لێی دەترسێن کابرا بە بێ حەج کردن بگەرێتەوە لەبەر ئەو کەمو کوریانەی هەیەتی لە مەرجەکانی یالە ڕوکنەکانی حەج کردن ، وەزۆر جار وەیە خەڵك چاو لە عەوامەکانی مەکەی دەکەن وەتێ دەگەن ئەوان مەناسیکەکانی حەجێ دەزانن فریویان پێ دەخۆن ئەوەش هەلەیەکی زۆر گەورەیە ( النووي ) وتویەتی بە عەوامەکانی مەکەی مەخەڵەتێن و فریو مەخۆن ، وە ئەمنیش دەڵێم ئەی برایان ئەی حاجیە بەرێزەکان فریو مەخۆن بە قسەی هەندێ پەیمان دەرەنەفامەکان چونکە ئەوان مەبەستیان حەج و عومرە و واجبات و ئیسراحەتی ئێوە نیە بە ڵکو مەبەستیان

دونیاو دۆلاری ئێوەیە دەیانەوێ زوو ئێوە بگەرێننەوە بەلام ئێوە پەلە مەکەن حەج و عومرەو واجبەکانتان تەواون بکەن هەندێ کەس هەیە دەچنە حەج بەلام روکنەکان و مەرجەکان و پێویستی یەکانی حەج نازانن بە نسبەت عومرە کردنیش هەر هیچی لێ نازانن تەنها ئەوە دەزانن دەچنە مەکەی پیرۆز یەك شتی فێر دەبن کەشیدەیەکی زەرد بکرن و دوایی دێنەوەو ناو لەپیان رادەگرن هەتا خەڵك ماچی بکەن بەم شێوە کاکم دەبێتە ( حاجی ) ناو لەپی حاجی بیدعەیە هەروەها مام حاجیش کە سەریان ماچ دەکا ئەویش هەر بیدعەیە .

( انس) دەگێرێتەوە وتی پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا ( الرجل منا يلقى اخاه او صديقه اينحنى له قال لا قل ايلتزمه قال لا قال افياخذه بيده ويصفحه قال نعم ) [٣]

واتە پیاوێك لەئێمە دەگاتە برایەکی خۆی یابرادەرێکی بۆی بچەمیتە وەفەرموی نەخێر ووتی لەباوەشی بگری وماچی بکا فەرموی نەخێر فەرمووی دەستی بگری وتەوقەی لەگەڵ دا بکا فەرموی بەڵێ وەبزانە تەواف کردن هەمەلایەنە یەلەسەر مەرجەکان و پێویستی‌یەکانی بۆنمونە یەکێکیان داپۆشین عەورەتە وە بزانە ی زۆربەی ئافرەتان خۆیان داناپۆشن وەلەسەر ئێمە پێویستە رێنمای‌یان بکەین هەتا بەبێ‌حەج کردن نەگەرێینەوە ، وەهەر ئافرەتێك تەوافی کرد ئەگەر پێ‌ی دیار بوو یاهەندێکی دیار بوو ، یاتەوافی کرد هەندێکی سەری رووت بوو ئەوە تەواف کردنەکەی دروست نیە هەتا داوە مووەکی سەری دیاربی ، یان نینۆکەکەی پەنجەی دیاربی ئەوە تەواف کردنەکەی دروست نی‌یە چونکە ئەوە (عەورەتە) یانی رووتی‌یە بۆیە پێویستە دای پۆشی لەکاتی تەواف کردن وەکو چۆن لەنوێژ کردن خۆی دادەپۆشی ، وەئەگەر تەوافی کردو ئەو شتانەی باسمان کرد دای نەپۆشی بوو ئەوە چۆن چۆتە حەج هەروەهاش بەبێ حەج

(١)سورة ال عمران / ٩٦

(٢) مناسك الحج و العمرة لمحمدنا ناصر الدين ص ٤

(٣) تفسير الكبير النور / ٣٠ المجلد ١٢

کردن و عومره وەکو خۆی دەگەڕێتەوە [1]. بۆیە لسەر ئافرەتان پێویستە پێش تەواف کردنێ پێیان بەلاچکی کراس یان داپۆشن یاگۆریەی لەپێ کەن وەکو چۆن لەنوێژکردن خۆیان دادەپۆشن بەڵێ ئافرەت دروستە لەگەڵ کۆمەڵێ ئافرەتی باوەڕ پێ کراو بچی حەجی واجب بکا بەلام بۆ حەج کردنی سونەت نا ، هەر دروست نیە ئەگەر ئافرەتەکان زۆریش بن بۆسەفەرێ کوریش لەگەلیان بچی ئیمامی شافعی لەسەر ئەو قسەیە [2].بەڵێ دەبێ حەج کردن لەجیاتی مردوو (الاستنابة)ئەگەر کابرا هەتا لەژیندا مابوو توانای حەج کردنی هەبووە بەلام حەجی نەکردوە ومرد ئەوە ئەگەر مالی لەدوا جێ مابوو دروستە حەجی بۆ بکرێ ئەگەرنا دروست نیيە لەسەر میرات گران حەجی بۆ بکەن ، وەلەجیاتی حەج کردنی (الاستنابة) دەبێ بەم شێوە ئەگەر مالی هەبوو یەکێکی پێ بەکرێ بگری بەلام دەبێ لەپێویستی خۆی زیاتری هەبی لەو ڕۆژەی ئەو کەسەی بەکرێ دەگری بەو مەرجەی ئەو کەسەی لەجیاتی دەچتە حەجێ جێگەی باوەڕپی یانی دادگەربی وەئەگەر نا لەجیاتی ناردنە حەج دروست نیيە ئەگەر یەکتریش ببینن چونکە کەس ئاگای لەنیەت نیيە وەحەج کردنیش بەنیەت دەزاندرێ ئەو مەرجەی دەبێ هەبێ وەهەر کەس بۆ ئەو کەسەی لەجیاتی ئەو حەج دەکا بەکرێ یاکە هاتەوە شتێکی بداتێ ومروالەتی ئەومەرجە پێویست دەکا لەسەر ئەو کەسەی حەجی بۆ دەکرێ دەبێ یەکێکی دادگەر بەکرێ بگریهەلو مەرجەکان و روکنەکان و واجباتەکانی حەجێ بزانی وەئەگەر ناکرێ یەکەش حەرام دەبی لەو کەسەی بەکرێ گیراوە حەجێ بکا وەکابراش لەحەجەکە بێ بەش دەبی ، هەندێ کەس هەنە پیاوەکی بەکرێ دەگری بۆ حەج یاعەمرە کردنێ یا مەناسیکەکانی تری حەج دەبێ ڕوونی بکاتەوە (افراد)ە یا (تمتع) ە یا (قران)ە وەلە (المجموع)دا هاتووە ئگەر یەکێ ووتی لەجیـــــاتی من بڕۆ حەجێ

(١)حجر علی الایضاح ص١٢٤

(٢)نهایة م ر ابراهیم البیجوری

ئەگەر (قران) یا (تمتع) ت کرد ئەوە شتەکی چاکت کردوە جا ئەگەر کابرا چوو (قران) یا (تمتع)ی کرد ئەوە ئەو کەسەی بەکریٚ چووتە حەجیٚ حەج کردنەکەی تەواوە.[٣]

# بەشیٚك لەسیفەتی ئیحرام بەستن و هەرچی لەدواوەی دەکریٚ

سیفەتی ئیحرام بەستن ئەوەیە بەدڵ نیەتی حەج کردنیٚ هەبیو ولەبەیکەی پیٚ بکا ، وەئەگەر عەمرەی بەست دەبیٚ نیەتی عەمرەی هەبی ، وەئەگەر مەبەستی پیٚکەوە کردنی حەج و عەمرەی هەبوو ئەوە پیٚویستە بەدڵ نیەت بیٚنی بەلاٚم دروست نی‌یە بەزمان وەبڵیٚ ولەبەیکەبکا بەلاٚم هەندیٚ لەزاناکان وتویانە دروستە ئیحرام دابەستان وتنی بەزمان و بەدڵ وەلەبەیکەشی پیٚ بکا . هەندیٚ لەزانایانی شافعی وتویانە واچاکترە بەدڵ نیەت بیٚنیوبەزمان وەبڵیٚ ی کەبریتی یە لە ئامادبوونی نیەتی دڵو وەبڵیٚ ی نیەتی حەج کردنم هیٚناو ئیحرامم بەست بۆ خوای گەورە ( **لبیك اللهم لبیك**)هەتا دوای وتنی لەبەیکە ، وەسونەتە لەو لەبەیکە کردنە ناوی ئیحرام بەستنەکەبیٚنی وەکو بۆ حەج کردن یان عەمرەی بەستاوەو دەڵی (**لبیك اللهم** ) بەو حەج کردنە لەبەیکە دەکەم هەتا دوایی یالەبەیکە دەکەم بەعەمرەیا بەحەج و عەمرە وەئەو لەبەیك کردنەش زۆر ئاشکرا نەکا یان باهەر بۆ خۆی گویٚی لیٚ بیٚ بەپیٚچەوانەی ئەو شتانەی دوایی کەبەئاشکرا دەکریٚ .[١] پیٚویستیەکی تر ئەوەیە دەبیٚ تەواف کردنەکەی بە هەموو لاشەی لەدەرەوەی هەموو خانوی بەیتیٚ بیٚ ئەگەر تەوافی کرد لەسەر (شاذروان)[٢]ی بەیتیٚ یان ل (**الحجر**) ئەوە تەواف کردنەکەی دروست نیە چونکە ئەوە تەوافی ( لەبەیتیٚ) کردیەیە نەك (بەبەیتیٚ) هەندیٚ کەسم دیوە زۆربە زەحمەت لەسەر دیوارەکان دەڕۆن لەڕوکنی لای ڕاستە بۆ لای بەردە ڕەشەکە

(٣)حجر علی الایضاح ص ١٣٣

هەتا ماچی بکەیت چونکە سونەتە بەم جۆرە تەواف کردنەکەیان بەتاڵ دەبێتەوە چونکە ئەمە ڕوکنەکە لەڕوکنەکانی تری حەجێ ، خوای گەورە فەرمانی داوە بەتەواف کردنی بەبەیتێو الشاذروان لەبەیتێ وەئەگەر تەوافی لەدەرەوەی (شاذروان) ی بەیتێ کردو یەکێ لەپێ یەکانی هەندێ جار لەسەر (شاذروان) دانێو بەپێ یەکەیتر بازدا ئەوە دیسان هەر تەواف کردنەکەی دروست نی یە وەئەگەر تەوافی لەدەرەوەی (شاذروان)کرد تەنیا لەدەستی دیوارەکانی بەرامبەر (شاذروان) یالەغەیری بەشەکانی تری بەیتێ دا ئەوا هەر تەوافەکەی دروست نیە لەسەر مەزهەبی ڕاست کەجەماوەری زانایان (قطـع)یان کردوە ، چونکە هەندێ لاشەی لەبەیتێ بووە پێویستە ئەلێرە ئاماژە بۆ شتێ بکەین چونکە زۆر وردە ، ئەویش ئەوەیە هەر کەسێ بەردی ڕەشی ماچ کردو سەری لەئاستی ماچ کردنەکە بوو لەبەشێکی بەیتێ پێویستە پێ‌یەکانی بچەسپێنێ لە شوێنی خۆی هەتا لەماچ کردنەکە دەبێتەوەو ڕاست ڕادەوەستی چونکە ئەگەر پێ یەکان لە شوێنی خۆی ترازا بۆلای ڕووی دەرگا کەمێك باوەکو چەند بستێك بێ لەحاڵەتی ماچ کردنەکە و لەوێ لاچوو لەتەواف کردنەکەی ئەوە بەشێك لەتەواف کردنەکەی بچڕاوە ، وەلاشەی لەهەوای (شاذروان) بێ ئەوە هەر تەواف کردنەکەی بەتاڵ دەبێتەوە .[٣]وەسونەتە دەست بەبەردەڕەشەکە داهینان و ماچ کردنی و دەست بەلای ڕاستە داهێنانیودوایی دەست ماچ کەی لەکاتی بەرامبەر وەستانی لەهەمووتەوافەکانی کەبریتی‌یە لەتەوافەکان وەبۆیان دووپات دەکەمەوە ئەبەو شێوە بۆیان چاکترە ، وەئەگەر لەبەر زەحمەتیش بۆیان نەکرابەردە ڕەشەکە ماچ بکەن ئەوە باهەر دەستیبدەنێ وەئەگەر بە دەست پێان

(١)الایضاح ص[١٥٤]

(٢)الشاذروان : بریتی‌یە لەو ئەندازەی تەرك کراوە لەپانی بنچینەی دەرەوە لەپانی ئەو دیوارەی لەڕوی زەوی بەرز بۆتەوە بەئەندازەی دووسێ‌یەکی بال

(٣)الایضاح ص[٢٤٦]

نەكرا ئەوە بابەشتێ ڕائاماژەی بۆ بكا ، دوایی ئەو شتەی ئاماژەی بۆ كردوە ماچیبكا بەلأم بەدەم ئاماژەی بۆنەكا ، وەبۆئافرەتانیش دروستە هەر دەست دەنە بەردە ڕەشەكەی نەك ماچی بكەن مەگەر بەشەو كەس لەتەواف كردنێ نەبێ [1].وەكو لە (الصحيحين) داهاتووە لە (انس) وتویەتی زۆربەی دوعای پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبو ﴿ اللهم آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار ﴾ واتە : ئەی خوایە لەدونیا چاكەو لەڕۆژی دوایش چاكەمان لەگەڵدا بكە لەئاگر بمان پارێزە (الشافعي) وتویەتی ئەودوعایەم پێخۆشترین دوعایەكە لەتەواف كردنێ بوترێ چونكە پێم لەهەموو دوعایەك خۆشترە لەنامە بەناو بانگەكەی ( الحسن البصري )داهاتوە كەبۆخەڵكی مەكەی ناردوە دوعا لەتەواف كردنێ لەمەكەی لەپازدە شوێنان خوا وەلأمی دەداتەوە ١- لەتەواف كردن ٢- لەكاتی (الملتزم) ٣-لەژێر پلوسكە (الميزاب) ٤- لەبەیتێ ٥- لەلای ئاوی زەم زەم٦- لەسەر سەفا ٧-لەسەر مەروە ٨- لەسەعی كردن(گورگە لۆقە كردن) ٩- لەپشت مەقام ١٠- لەعەرەفات ١١- لەموزدەلیفەی ١٢- لەمینا ئەوانی تریش لەلای كۆ گابەر دەكات كە (٣) شوێنە .[2]سودێكی تر شێخ (عزالدين بن عبدالسلام)وتویەتی تەواف كردن لەگەورەترین ڕوكنەكانی حەجێ دێتە ژمار هەتا لەڕاوەستانیش لەبەر ئەوە بەنوێژكردنێ دەچی وەهەمەلایەنە لەسەر نوێژ كردن ، وەنوێژكردن لەحەجێ گەورەترە ، وەهەمەلایەن لەسەر گەورەتری گەورەترە . وەگورگە لۆقەكردن (السعي) ڕوكنەكە لەڕوكنەكانی حەجێ لەلای (ابو حنيفة واحمدو والثوري الشعبي ) ڕوكنەك نیە بەڵكو واجبە بەخوێن دان پڕ دەبێتەوە بۆ ئەو كەسە بەئەنقەست تەركی كردووە یا سەهوی كردوە و گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی . وەئەو فەرمودەی دەڵێ ﴿ اسعوا فانه كتب عليكم السعي ﴾[3]واتە گورگە لۆقە بكەن چونكە لۆقەتان لەسەر پێویست كراوە . ابن عباس وانس وابن سيرين ریوایەتەك لە ئەحمەدی بۆ ئەوە چونە سونەتەو بەواز لێ هێنانی هیچ شتێك پێویست ناكا بەڵگەیان بەو فەرمودەی خوای گەورە هێناوەتەوە ﴿فلا جناح عليه

ان يطوف بهما ﴾واته : جا هەر كەسێ بەو دووە تەواف بكا گوناحی لەسەر نیە : ابو حنيفة و الثـوری والحسـن بۆ ئەوە چونە بەڵكو خوێن دانی لەسەر پێویستەو خاوەنی (المغنـی) یش هەر ئەوەی لەپێشـتر داناوە چونكە بەڵگە لەسـەر ئـەو كەسەی‌پێویست كردوە بەڵگەش لەسەر ڕەهایی (مطلق)پێویست بوونە نەلەسەر ئەو شتەی ئەگەر بەوی تەواونەبێ ئەوانیش واجب دەبێ .[4] بەمەرج دەگیرێ مەبەستی ڕەمی كردن جا ئەگەر ڕەمی لەهەوای كرد كەوتە شوێنی ڕەمی‌كراوی ئەوە بۆی ناژمێردرێ ئەگەر مەبەستی نیشانەیەكی دانراوی كۆگا بەردەكات یادیواری كۆگا بەردەكان بی و باوەڕی وابی شوێنی ڕەمی كراوەكەیە وەكوز زۆربەی نەفامەكان دەیكەن جائەگەر كەوتە شوێنێی ڕەمی كراوەكە ئەوە دروست نی‌یە لەبەر مەبەستی غەیری ئەو شوێنەی ڕەمی كراوەكە [5].هەركەسێ بەخۆی پێی نەكرا ڕەمی بكا یانەخۆش بی كەبەخۆی بزانی یایەك دوو دكتۆری دادگەر پێی بڵێن یائەوەتە حەزی لێ بی یەكێك لەجیاتی خۆی بنێری ڕەمی بۆ بكا ، وەسونەتەو چەسپاوە كابرا بچی بەردەكان هەڵبگری‌ئەگەر توانای هەبوو وە (الله اكبر) بكا ، هەروەها دروستە لەجیاتی خۆ ناردن (النيابة)كەسێ لەبەر هەر هۆیەك بەخۆی پێی نەكرێ ، وەئومێدی چاك بونەوەشی نەبی لەپێش كاتی دەرچونی ڕەمی كردن جا هەر كەسێ گومانی وابو توانای هەیە لەڕۆژی سێیەم قەدەغەیە یەكێك لەجیاتی بنیرێ وەكو لە لە (المجموع) داهاتوە چونكە ڕۆژە ڕوناكەكان وەكو یەك ڕۆژ وایە ئەگەر نەفەوتا لەكاتی بەجێ هێنانی مەگەر بەڕۆیشتنی هەموو ڕوكنەكانی نەبێ ئەی برایان ئەو مەسەلە زۆر گرنگە كاتێ

(١) الايضاح ص ٣٦٧

(٢) الايضاح ص ٢٧١

(٣) رواه ابن ماجه

(٤) فقة السنة

(٥) حجر على الايضاح ص ٢٥٨

هەزاران کەس دەڵێنە برادەرەکانیان ئەمڕۆ لەجیاتی من ڕەمی بکە ، ئەمڕۆ زۆر گەرمە وەیاشوێنەکە دورە یالەبازاڕی کارێکم هەیە ، یا داوا لەبرادەرێکی بکا ڕەمی بۆ بکا بەپارە یا شتی تر بەڕاستی ئەوانە عوزری شەرعی نینە . ئەوە عادەتی هەندێ کەسی نەفامە مەبەستمان دونیایە نەك دین ، چونکە لەبازاڕی دەگەڕێن هەتا ماندوو دەبن بەلام ناتوانن نوێژەکی بەکۆمەڵ بکەن ، بانگدەری حەرەمی شەریف بانگی دا ئەوان لەبازاڕی هەرخەریکی ئیش و کاری خۆیان بوون لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان دەڵێن یەك نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوتی حەرام خێری زیاترە لەنوێژی بەتاکی ولاتی خۆیان بەچەند قات لەتەمەنی نوح پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ دەڵێن ئەگەر بەندایەتیەکانی تریان بخرێتە تەك لەکارە تەواوەکان حیساب کردن پەکی دەکەوێ لەبەر کورت هەڵێنانی پاداشتەکەی .[1] حەجی وەرگیراو بریتی‌یە لە خوای گەورە ترسان ، بەدڵو دەرون و گەڕانەوە بۆ گوێ ڕایەڵی وبەندایەتیەکانی بەئەندامە دیارەکان وشاراوەکان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ تفكر ساعة خير من عبادة ستين سنة في التفضيل ﴾ لەپێشەوە کراوەتە کوردی . ئەگەر یەکێك ئیحرامی بەست بۆ عومرە کردن لە حەرەم ئیحرامەکەی دادەمەزرێ ولەسەریەتی دەرچی بۆ حەلاڵ بونی هەر بەئیحرامەوە وەدوایی دەست بەتەواف و سەعی کردن دەکا سوێند دەخوا عومرەکەی تەواوە خوێن دانی لەسەر نیە ، وەئەگەر لەئیحرام دەرنەچوو تەوافی کردو سەعی کردو مووی سەری کورت کردەوە ئەوە دووقسەی شافعی‌یە ڕاست ترینیان عەمرەکەی دروستە و جائیزە بەلام خوێن دانی دەکەوێتە سەر چونکە تەرکی ئیحرامی کردوە هەتا لێی دەردەچی . والله اعلم سودێك پێشەوایەکان زۆریان قسە کردوە لەبارەی ئافرەتی حەج کەر ئەگەر بکەوێتە بێ نوێژی پێش تەواف کردنی (الافاضة) وەپێ یان نەکراوە دوا کەوتون لە لەبەربێ نوێژی . (بازی) لەومەسەلەیە قسەیەکی درێژی جوانی بەدەست کەوتووە دەڵێ ، هەر ئافرەتێ دەرمانی بەکار هێناو خوێنەکە بڕایا دەرمانە بڕاو

خۆی شوشت وەتەوافی کرد دوایی خوێنەکە هاتەوەدوای سەفەرەکەی دروستە بۆی کار بەیەکێك لەو قسانەی شافیعی بکا : هەر ئافرەتێ خوێنی بڕا ڕۆژ ڕۆژە ئەوە ڕۆژی پاك بوونەوەی بۆی بەپاکی دادەنرێ لەسەر یەکێك لەو قسانە قسەی ئاشکرا بەقسەی ( التلفیق ) وەکۆمەڵێك زانای تر بەباشیان زانیوە وەمەزهەبی مالك و احمدیش لەسەر ئەو قسە ڕێکن خاوێن بوونەوەی لەو ڕۆژانەی خوێنی بێ نوێژیەکەی دەبڕێ بەخاوێن بوونەوە دادەنرێ .[٣] بەشێك لەروون کردنەوەی زیارەتی پێغەمبەر (ﷺ)دروست نیە سوڕانەوە بەدەوری گۆری پێغەمبەر (ﷺ)بەڵکو دەبێ لەگەڵی بەئەدەب بی و لێی دورکەویەوە ، وەکو لەکاتی ژیانی ئەگەر لای بای دەبوایە لێی دورکەویەوە ، پێویستە فریونە خۆی بەزۆری خەڵکی نەفام وەتەماشای کردەوەی خەڵکی عەوام ونەفام نەکەی ( ابوعلی الفضیل بن عیاض ) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەم بارەیەوە جوانترین قسەی هەیە دەڵێ بڕۆ دووڕێگەی هیدایەتی ئەو کەسانەی کەمن زیانت پێ ناگەین وەبترسە لەڕێگایی گومڕایی و فریومە خۆبە زۆری ئەو کەسانەی خۆ لەناو دەبەن ، وەهەر کەس بەدڵی دابێ مەسح کردن بەدەست وێنەی شتیوا بەرەکەتی زیاترە ئەوە لەنەزانی و بێ ئاگایتی چونکە بەرەکەت بریتییە لەوەیبەرێکی شەرع و قسەی زانایان بێ وەچۆن چاکیەکت دەوێ پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) [١] (سودێك ) مالك پێی ناخۆشە بلێی زیارەتی گۆری پێغەمبەرمان کرد کەپێچەوانەی زیارەت کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بێت . ڕیوایەت کراوە ( ابراهیم ) (ﷺ) بەفریشتەی گیان کێشانی وت کەبۆ گیان کێشانی هاتبوو ئایا قەتت دیوە خۆشەویست گیانی خۆشەویستی خۆی بکێشێ ؟خوای گەورە وەحی کرد بۆ (ابراهیم)وەفەرموی ئەدی قەتت دیوە خۆشەویست گەیشتنە لای خۆشەویستی

---

(١)حجر على الايضاح ص ٤٣٢

(٢)الايضاح ص ٤٤٤

(٣) حجر على الايضاح ص ٣٨٧

پێ ناخۆش بێ ، جا ابراهیم به فریشتەی گیان کێشانی فەرموو هەر ئێستا گیانم بکێشە .[٢] هەروەها لە کەرامەتەکانی ابو بکر ڕیوایەت کراوە کاتێ جەنازەکەی هەڵگیرا بۆ لای دەرگای گۆری پێغەمبەر (ﷺ) بانگ کرا ئەی پێغەمبەری خوا سەلامەت لێ بێ ئەوە جەنازەی (ابو بکر) سەر بە خوا ڕاست دەرگاکە کراوە دەنگەك لە گۆڕی پێغەمبەرەوە هات (ﷺ) فەرمووی خۆشەویستی بێننە لای خۆشەویستی.[٣]

# بەشێك لەزکرەکان

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ واذكر ربك في نفسك تضرعا وخيفة ودون الجهر من القول ﴾واتە : وەیادی پەروەردگارت بکە لەدڵی خۆتدا بەگریان و زاری و ترس وبێ رەنگ ) وتویانە زکرەکان لەدەرون ئەوەیە گەورایەتی خوا بکرێ . لەبەر ئەو ئایەتەی سەرەوە دەبێ دوعا کردن بە ئەدەب و شاراوە بێت ، وە موسڵمانەکانی بەرایێ زۆر دوعایان دەکرد بەڵام کەس گوێی لە دەنگیان نەدەبوو ، چونکە دوعایەکانیان لە بەینی خۆیان و خوایان بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ خير الذكر الخفي وخير الرزق ما يكفي ﴾ واتە : چاکترین زیکر ئەوەیە بەکڕی بکرێ وەچاترین ڕزق ئەو ڕسقەیە بای ئەوە بێ بەشت بکا . ( ابو هريرة ) وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ انا مع عبدي ماذكرني وتحركت بي شفتاه ﴾[١]واتە : من لەگەڵ بەندەی خۆم دامە هەتا زکرم بکاو لێوەکانی بەزکری من بجوڵێنێ معاذی کوڕی جبل وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ﴿ ما عمل ابن آدم عملا انجى له من عذاب الله من ذكر الله ﴾[٢]واتە : هیچ کردەوەیەکی بەنی ئادەم وەکو زکر کردن نیە لەجەهەنەمی ڕزگار کا . ابو

(١)حجر على الايضاح

(٢)تفسير الكبير المجلد ٤ص٢٠٥

(٣)تفسير الكبير المجد ٢١ ص٨٧

هریره وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ﴿ مـا جلـس قـوم مجلسـا یذکـرون الله فیـه الا حفتهم الملائکـة وغشـتهم الرحمـة وذکرهـم الله فیمـن عنـده ﴾ [٣] واتـه : نیـه کۆمەلـه کەسێك پێکـەوە دانیشـن وەزکـری خـوا بکـەن مەگـەر فریشـتەکانی خـوا چـوار دەورەیان دەدەن و بەرەحـمـەت دایان دەپۆشن وەخوای گەورەش زکری وان دەکا . وەمەبەست لە زکر کردن سـبحان الله والحمـدالله کـردن و قورئـان خوێنـدن و ئـەو شتانەیە وەلەفەرمودەدا هاتووە کەوا بەڵگەیـە لەسـەر هـەندێ زکر کـردن لەهـەموو کردەوەیەك گەورەترە ئەوە (الترمذی)و (ابن ماجة)و (الحـاکم)بەڕاسـتی داناوە لـەو فەرمودەی (ابی الـدرداء) داهـاتوە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی ﴿ الا اخـبرکم خـیر اعمالکم وازکاها عند ملیککم وارفعها في درجاتکم وخیر لکم من انفـاق الذهـب والـورق وخیر لکم من ان تلقوا عدوکم فتضربوا اعناقهم ویضربوا اعنافکم قالوا بلـی قـال ذکـرالله ﴾ واتـه : ئاگـاداربن هـەواڵتان بدەمێ بـەچاکترین کـردە وەتـان و پاکـترینی لـەلای پاداشـاتان و بـەرزترینیـان لەپلەکەتان وەچاکتر بێ لەخـەرج کردنـی زێـرو زیـوو وەچاکتر بێ بۆ ئێوە بگەنە دوژمنەکەتان وە لەملیان بدەن و لـەملتان بدەن وتیـان بـا ئـەی پێغەمبـەری خـوا فـەرموی زکـر کردنـی خوایـە ) ئـەم فەرمودەیـە لەگـەڵ فەرمودەکانی گەورایەتی جیهاد دژی یەك نینە چونکە جیهاد کردن لـەزکر کـردن گـەورەترە چونکـە مەبەسـت لـەزکر کـردن کەلەجیـهاد گـەورەترە یـانی زکـر کـردن بەزمان و بەدڵ و بیر کردنـەوە لەماناکـەی وەئامـادەکردنی گەورایـەتی خـوا لـەدڵ ئەو جۆرە زکر کردنە لەجیهاد کردن گەورەترە دەنا جیـهاد کـردن لـەزیکر کردنـێ گەورەترە کەتەنها بە زمـان بـێ وەئـەو فەرمودەیـەی کـەئاماژەی بۆ دەکا دەڵـێ ﴿ نیة المؤمن خیر من عمله ﴾واتە : نیەتی بڕوادار خێری لەکردەوەکـەی زیـاترە ) لـە شەدادی کوڕی اوس ووتی پێغەمبەر (ﷺ) فـــەرمویەتی گـــــــــەورەی داوای

(١)اخرجه ابن ماجه وصححه ابن حبان وذکره البخاری تعلیقا

(٢)اخرجه ابن ابی شیبة والطبرانی باسناد حسن

(٣)اخرجه مسلم

لێخۆشبون (سید الاستغفار) ئەوەیە بەندە بڵێ ﴿ اللهم انت ربی لا الـه خلقتنـی وانـا عبدك وانا علی عهدك ووعدك ما استطعت اعوذبك من شرّ ما صنعـت ابـوء لـك بنعمتـك علی وابوء بذنبی فغفر لي فانه لایغفر الذنوب الا انت ﴾[1] واتـه : ئـەی خوایـە هـەرتۆ پەروەردگارمی هیچ خوا نیە ئەتۆ نەبی وەهەر تۆ منت بەدیهێناوە وەمن بەندەی تۆمە وەمـن لەسـەر پـەیمان و وادەی تۆمـە ئـەوەندەی بـۆم بکـرێ ، خـۆم بـەتۆ دەپارێزم جا لێم خۆش بە کەس نیە لەگوناح خۆش بێ مەگەر هەر تۆ نـەبی بوخاری و موسلیم لەئەبو هریرە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ﴿ کلمتان حبیبتـان الی الرحمان خفیفتان علی اللسان ثقیلتان فی المیزان سـبحان الله بحمـده سـبحان الله العظیم ﴾واتـه : دوو ووشـه لای خـوا زۆر خۆشەویسـتن لەسـەر زمـان زۆر ئاسـانن لەتەرازوو زۆر گرانن ئەویش ( سبحان الله وبحمده ) و (سبحان العظیم). لـه سمرةبـن جندي وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ﴿ احـب الکـلام الی الله اربع لایضرك بأیـهی بدأت سبحان الله والحمدالله ولا اله الا الله والله اکـبر ﴾[2]واتـه : خۆشەویسترین قسـه لای خـوا چوار شتە بەهـەر یەکێکیان دەسـت پـێ بکـەی زیـانی پـێ ناگـەینی ( سبحان الله ) و( الحمدالله ) و ( لاالـه الا الله ) و ( الله اکـبر ) پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرموی ﴿ من قال لااله الا الله وحده لاشریك له عشر مرات کان کمن اعتـق اربعـة انفـس مـن ولد اسماعیل ﴾[3]واتە : هەر کەسێ ڕۆژێ (١٠) جار بڵێ﴿لااله الا الله وحده لاشریك له ﴾ وەکو ئەوەیە (٤) کەسی لەکوڕی اسماعیل ڕزگار کردبی وەئیمامی موسلیم ئەوەشی لێ زیـاد کـردەوە ﴿ لـه الملـك ولـه الحمـد وهـو علـی کـل شـئ قدیـر ﴾ لەڕیوایەتەکی تر هەر کەسێ ئەو دوعایە ڕۆژێ سـەد جـار بکا وەکەو ئەوە وایـە (١٠) بـەندەی ئازادکردبی و (١٠٠) چاکەی بۆ دەنوسـرێ و (١٠٠) خراپـەی بـۆ ڕەش دەکرێتەوە وەبۆی دەبێتە قەڵاو وەلە شەیتانی دەیپارێزێ لەو ڕۆژی هەتـا

(١)اخرجه البخاری

(٢)اخرجه مسلم

(٣)متفق علیه

ئێوارێ ، کەس ڕۆژی قیامەتێ لەو چاکتر نیە مەگەر کەسێ لەو زیاتر ئەو زکرەی کردبێ . احمد له حوریریه کچی الحارث هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿ لقد قلتُ بعدكِ اربع لووزنت بما قلت منذ اليوم لوزنتهن سبحان الله وبحمده عدد خلقه ورضاء نفسه وزنه عرشه و مداد كلماته ﴾[4] واته : لەدوای تۆ چوار وشەم وت ئەگەر بمکێشابایە بەو زکرانەی تۆ لەبەیانیانە وەکردوتە هەموی دەکێشا ئەویش ئەو چوار وشەیە (سبحان الله وبحمده وعدد خلقه ورضاء نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته ﴾ لەمعاذ بن جبل پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ اوصيك يامعاذ لاتدعن دبر كل صلاة ان تقول اللهم اعنى على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك ﴾[5] واتە : ئەی معاذ ئامۆژگاریت دەکەم لەپاش نوێژەکان لەبیر نەکەی بڵێی ئەی خوایە یارمەتیم بدە لەسەر زکر کردنت و سوپاس کردنت و بەجوان ترین شێوە بەندایەتیت بکەم . (فضالة بن عبيد)دەیوت پێغەمبەر ( ﷺ) گوێی لەپیاوەکی بوو دوعای دەکرد لەنوێژەکەی سەلاواتی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) نەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەم پیاوە پەلەی کرد دوایی بانگی ئەو پیاوەیا یەکێکی تری کرد ووتی ئەگەر یەکێکتان دوعای کرد با (الحمد الله)بکاو سەنای خوا بکادوایی سەلاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدا دوایی چەندی پێ خۆشە با بپارێتەوە ( ئەو فەرمودەیە جوان و ڕاستە ) ( رزين ابن معاوية) لەکتابەکەی خۆی ڕیوایەتی کردوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ﴿ الدعاء موقع بين السماء والارض لايصعد حتى يصلى على فلا تجعلوني كعمر الراكب صلوا على اول الدعاء وآخره واوسطه ﴾[6] لەپێشەوە کراوەتە کوردی سورەتی فاتیحە حەوت ئایەتەو دەرگای جەهەندەمیش حەوت دەرگایە هەر کەسێ هەر حەوت ئایەتی خوێند هەر حەوت دەرگای جەهەندەمی لێ دادەخرێ چونکە ڕیوایەت کراوەجبرائیل بەپێغەمبەری ووت ئەی موحەمەد ئەمن هەتا ئێستا زۆر لەعەزابی ئومەتەکەی تۆ دەترسام بەڵام

---

(٤)اخرجه مسلم

(٥)رواه احمد وابو داود والنسائي بسند قوى

کاتێ سورەتی فاتیحەم هینا خوارێئەمین بوم لەعەزابی ئومەتەکەم پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بۆ ئەی جبرائیل ، ئەوەیش وتی خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ وان جهنم لموعدهم اجمعين لها سبعة ابواب لكل باب منهم جزء مقسوم ﴾ سورەتی فاتیحە حەوت ئایەتەو جا هەر کەسی خوێندی هەر ئایەتێك دەبێتە تەبەقەیەك لەسەر دەرگای جەهەندەمێ ئەنجا ئومەتەکەت بەسەلامەتی بەسەری دا تێدەپەڕن . [2]

بەشێك لەڕون کردنەوەی هەندێ حیکایەتی پڕو پووچ شەیتان هەندێ فەرمودە گێڕەوە (المحدثين)ی فریوداوە بەریوایەت کردنی فەرموودەی هەڵبەستراو بەبێ ئەوەی ڕوونی بکەنەوە کەهەڵبەستراوە ئەوەی ئەوانە دەیکەن تاوانە لەسەر شەریعەت و مەبەستیان ڕەواج دانە بەقسەکانیان وریوایەت زۆر کردنەوە پێغەمبەر ( ﷺ) فەرمویەتی ﴿ من روى عني حديثا يرى انه كذب فهو من الكذابين ﴾ [3] واتە: هەر کەسێ فەرمودەیەك لەمن ریوایەت بکاو بزانی درۆیە ئەوە لەڕیزی درۆزنانە جابا لەخوا بترسن ئەو کەسانەی هەر لەخۆیانەوە دەربارەی دین قسە دەکەن کەپێچەوانەی قورئان و سونەتی ئەسحابەکانە وەخەڵکی پێ گومڕا دەکەن ئەوە ئەو شتە پێغەمبەر ( ﷺ) ئێمەی لێ وریا کردۆتەوە ڕووی داوەو زۆر بووە وەلەنێو خەڵکی بلاَبۆتەوە ﴿ انا لله وانا اليه راجعون ﴾ئەو حیکایەتە درۆو دەلەسە هەلبەستراوانە کەلەهەندێ بەناو مەلا گوێمان لێ دەبی بۆ نمونە دەگێڕنەوە دەڵێن کابرایەکی ئاگر پەرست هەبوو لەبەر خاتری ڕەمەزانێ ڕۆژەکێ لەکوڕەکەی دا لەپاشان ئاگر پەرستەکە مرد ، لەخەو دیتیان کابرای ئاگر پەرست والەناو بەهەشتێ پیاسەی دەکا پێ یان وت کاکێ ئەوە

(۱)تفسير ابن الكثير المجلد ٣ ص[٥١٤]

(٢)تفسير الكبير ج١ص[١٧٥]

(٣)تلبيس ابليس

بەچی گەیشتیە ئێرە ئەدی ئەتوو ئاگر پەرست نەبووی ؟ وتی بەلی بەلام ڕۆژەکێ لەکورەکەم دا چونکە لەرەمەزانێ لەبەر چاوی خەلکی نانی دەخوارد ئەمنیش وتم ئەو مانگە لای موسلمانەکان زۆر گەورەیەو نانی بەئاشکرا لەبەر چاویان مەخۆ ئەوە وا خۆم لەبەهەشتێ دەبینمەوە ، جا سەرم سوڕماوە هەندێ کۆلکە مەلای وا هەیە ئەو حکایەتە درۆوو دەلەسەی لەخوتبەی جومعان دەخوێنێتەوە مەلای واهەیە لەمەولودی پێغەمبەر ( ﷺ) دەخوێنێتەوە گوێم لەمەلایەکی مزگەوتێ بوو ئەو حیکاتە درۆیە دوو جار لەدوو خوتبان لەمانگەکی باس کرد دوای نوێژی هەندێ خەلك دەیانگۆت ماشەلا خوا لەهەموو کەسی خۆش دەبی ئەگەر چاکەی بکا بائاگر پەرستیش بی ، ئەوە هەلەیەکی زۆر گەورەیەو قسەیەکی زۆر ناشیرینە چونکە ئەم حیکایەتە ڕێ خۆش کردنە بۆ هاوبەش پەیدا کردن لەگەلْ ئەوەی پێچەوانەی دەقی قورئانی پیرۆزە وەکو خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ ان الله لا یغفر ان یشرك به ویغفر مادون ذلك لمن یشاء ﴾ واتە : بەڕاستی خوا لەوە خۆش نابێ کەهاوبەشی بۆ دابنرێ وەگوناحانی تر بۆ هەرکەس بیەوێ خۆش ئەبێ بەلام نامەلا بۆچی نالێی خوای گەورە سەبارەت بەهەندێ هیدایەتی ئەو ئاگر پەرستەی داو باوەڕی هێناو موسلمان بوو دوایی مردو خوا لێی خۆش بووە ئەو ها بلێی باشترەو قسەیەکی ڕاستە .

حیکایەتەکی درۆینەی تر ، جارێکیان مەلایەکی مزگەوتێ ئامۆژگاری خەلکی دەکرد گوتی ئەوە شێخ عبدالقادری گەیلانی بەگاورەکی وت وەرە ئیسلام ببە ، ئەویش وتی عیسا پێغەمبەری ئێمە مردوی زیندوو دەکردەوە بەلام (محمەد)پێغەمبەری ئێوە مردوی زیندوو نەکردۆتەوە عبدالقادری گەیلانی وتی ئەوجا ئەوە چیە ئەمن مردووت بۆ زیندو دەکەمەوە ، گاورەکە ووتی ئەگەر ئەتۆ مردوی زیندو بکەیەوە ئەوە ئەمنیش لەسەر دەستی تو ئیسلام دەبم عبدالقادر وتی دەباشەبەگەلم کەوە پێکەوە ڕۆیشتن هەتا چوونە سەر قەبرستانەکەی گاورکە وتی یاشێخ پێم خۆشە ئەو گۆڕەم بۆ زیندوو بکەیەوە

وەعبدالقـادری گـەیلانی بەگاورەکـەی وت پێغەمبەرەکـەی ئێـوە چـی کـەمردوی زیندوو دەکردەوە ، وتی دەیوت ﴿ قم باذن الله ﴾شێخ وتـی (قـم بـاذنی) یەکسەر گۆرەکە لەجێی خۆی شەق بوو پیاوەکی لێ هاتە دەرێ وتـی ئەرێ ئـەوە چـی قەومایە قیامەت داهاتووە وتـی نەخێر هەروا لەحالت دەپرسین پیاوەکەی ناو گۆرەکە وتـی حالّم زۆر باشە ئەوە ملوانکەیەکی حۆریەکی پسابوو دەمویست بـۆی چـاك بکەمـەوە ئـەوە ئێـوە بانگتـان کـردم بێجگـە لـەوە چـی تـرم نـەدیوە وەلاگاورەکە بێسێ دوو موسلّمان بوو ( دەککە لە قورت نیم لەگەڵ دروّت) هۆ مەلا ئەتو خەلّکی هان دەدەی هەتا رێی راست بگرنە بەر بەو حیکایەتە درۆ و دەلەسانە بۆ شارەزای خەلّکی ناکەی بەو شتانەی لەقورئان و سـونەتی پـاکی پێغەمبەر ( ﷺ) داهاتووە هـەتا بۆ خـۆت و بـۆ خـەلّکی ببێتـە هـۆی ڕۆنـاکی و مایـەی رزگار بوون وە ببێتە بەلّگە لەرۆژی قیامـەتێ هۆ کۆلکە مەلای هـەژاری بەستە زمان شێخ عبدالقادرت لەعیسـا بەگـەورەتر دانـاو عبدالقـادرت کردۆتـە شەریکی خوا خوا پاك و خاوێنە لەو هاوبەشی بۆ دانانە . لەمەکەی موکەڕەمە گوێم لەدەرسی ماموستایەکی ڕاگرتبوو لەگەڵ هەندێ قوتابی یان دەرسی پێ دەگوتین پیاوێك هات کاغەزێکی دایە مامۆستاکە ، دوایی ماموستاکە وتـی ئەی برایان ئەو کاغەزە ئەوەی لێ نوسراوە گوایە یەکێ لەوەلیەکانی خوا لە (مصر) لەخـەوێ پێغەمبـەری ( ﷺ) ی دیـوە وەهـەوالّی پـێ داوە دەجـال پاشـی (٦٠) سالّی تر دێ ڕۆژ لەلای ڕۆژ ئاوا هەلّدێ و پاشی (١٠٠) سالّی تر قیامـەت دادێ جامامۆستاکە وتی ئەی برایان ئەو کەسەی کاغەزی وای خوێنـدەوە وەلەسەری پێویسـتە یەکسـەر بیسـوتێنی چونکـە ئەمـە لـەفرو فێـلّ و درۆ دەلەسـەی جولەکەکانـە ئـەو شـتانە لەکاغـەزان دەنوسـن و لـەولاّتانی ئیسـلامی بـلاّوی دەکەنەوە هەتا پاش ئەو مارەیە بلّێنەموسلّمانەکان کوا کەری دەجالی کوا ڕۆژ لەرۆژ ئاوا هەلات ئەمانەهەمووی درۆیە بەلام دەیانەوێ پێی سومعەی ئـاینی ئیسلام بشێوێنن دەنگ و باسی هاتنی ڕۆژی قیامـەتی خوانـەبی کەس نـازانی

هەتا جوبرائیل بەپێغەمبەری ووت ( ﷺ) هەواڵم بدێ دەربارەی هاتنی ڕۆژی قیامەت پێغەمبەر ( ﷺ) فەرمووی لێپسراو زاناتر نیە لەپرسیارەکەی هەتا دوای فەرمودەکەی .

# هەندێ حیکایەتی خۆشو ناسك

خاوەنی (کشاف) گێڕاویەتەوە (عمران بن حطان الخرجی) لەهەموو کەس ڕەش تر بوو وەژنەکەشی لەهەموو ژنان جوان تر بوو ، ڕۆژەکی ژنەکەی تەماشای (عمران)ی کردو وتی ( الحمدلله X عمران ) وتی هاچیە ژنەکە وتی سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەوەی هەردوکمان خەڵکی بەهەشتین چونکە ئەتو ژنەکی وەکو منت هەیە شوکرانەی خوا دەکەی وەئەمنیش مێردەکی وەکو تۆم هەیە سەبرم گرتووە وەخوای گەورەش وادەی بەهەشتی بە سوپاس گوزاران و سابیران داوە . (المصنف)وتویەتی هەندێك شێخ حیکایەتەکی زۆر سەیریان بۆگێڕامەوە لە (ابن عقیل)ی وتویەتی پیاوێکم گەیشتێ وتی ئەمن هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژ دەشۆم دوایی دەڵێم نەم شوشتوە (الله اکبر )دەکەم دوای دەڵێم نەم کردوە (ابن عقیل) ووتی مادام وەیە نوێژ مەکە ، هەندێ کەس ووتیان (ابن عقیل) چۆن وای پێ دەڵێی ! وتی پێغەمبەر ( ﷺ) فەرموویەتی قەڵەم لەسەر شێتان هەڵگیراوە هەتا چا دەبێتەوە وەئەو کابرایەش شێتەچونکە دەڵێ (الله اکبر)دەکەم و دەڵێم نەموتوە . (ابن عثمان) وتی عیسا پێغەمبەر لەسەر لوتکەی چیایەکی نوێژی دەکرد (ابلیس) هاتە لای و وتی عیسا ئەتۆ لات وایە هەموو شت بەقەزاو قەدەری خوایە عیسا وتی بەڵێ (ابلیس) وتی دەمادەم وەیە لەسەر ئەو چیایەی ڕا خۆت فڕێدە خوارێ عیسا وتی ئەی نەفرەت لێ کراو خوای گەورە بەندەی خۆی تاقی دەکاتەوە نەك بەندە خوای تاقی بکاتەوە .

(حسین الرازی) ووتی لای ئەحمەد بن حەمبەل دانیشتبوم پیاوێکی خەڵکی خۆراسان هاتە لای وتی ئەی باوکی عبدالله چەند درهەمێکم هەیە حەجی پێ

بکەم ! ئیمام ئەحمەد وتی نەخێر برۆ بەو درهەمانە لە (باب الکرخ) تۆی بکرەو لەسەر سەرت دانێ و بیفرۆشەوەکەپارەکەت بووە (۳۰۰) درهەم ئەنجا برۆ حەجی پێ بکە پیاوەکە وتی ئەی باوکی عبد الله کارو کاسبی خەڵکی نابینی ئەحمەد وتی ئەو قسانە مەکە هەرکەسی خۆی لەوە لادا دەیەوێ ژیان و گوزەرانی خەڵکی تێك دا پیاوەکە وتی ئەی باوکیعبدالله ئەمن پشت بەخوا دەبەستم (متوکل) م ئەحمەد وتی مادام پشت بەخوا دەبەستی بەتەنێ دەچیە حەجێ یالەگەڵ خەڵکی ! پیاوەکە وتی لەگەڵ خەڵکی ئەحمەد جوانی جواب داوەو ووتی درۆی دەکەی ئەتو پشتت بەخوا نەبەستوە بەڵکو پشتت لەسەر جۆرکی خەڵکی بەستووە . لە (عکرمة) ریوایەت کراوە (ابن رواحة) لە تەنیشت ژنەکەی پاڵی دابۆوە (ابن رواحة) کەنیزەیەکی هەبوو لەو دیوی ژورەکەی پاڵی دابووە وە هەڵسا چووە لای کەنیزەکەی ژنەکەی ترسا و هاواری کرد کە دیتی مێردەکەی لە جێگای خۆی نەماوە دوایی ژنەکە هەڵسا چووە دەرێ دیتی مێردەکەی وا لە سەر کەنیزەکەیتی ژنەکە گەڕاوە ژوورێ چەقۆیەکی هێنا دوایی چووە دەرێ مێردەکەی لێبۆوە هەڵستا تووشی ژنەکەی بوو چەقوەکی پێیە ، ووتی ئێی ، ووتی ئێی ؟! ئەگەر لە کوێم دیتی دەت گەیشتمێ بەو چەقوەیەی لە نێو شانم دەدای مێردەکەی ووتی لە کوێت دیتم ژنەکە ووتی لەسەر کەنیزەکەم دیتی مێردەکەی ووتی نەتدیوم وە پێغەمبەر ( ﷺ ) قەدەغەی کردووە بەلاشە پیسی قورئان بخوێنین ژنەکە ووتی دەقورئانم بۆ بخوێنەو وە بەخۆشی قورئانی نەدەخوێند پیاوەکە ووتی

(اتانا رسول الله یتلو کتاب — کما لاح مشهور فی فجر ساطع

التی بالهدی بعد العمی فقلوبنا — به موقنات ان مال واقع

یبیت یجافی جنبه عن فراشه — اذا استشقلت بالمشرکین المضاجع [1]

جا ژنەکەی ووتی باوەڕم بەخوا هەیە و چاوم درۆی کردووە بەیانی چووە لای پێغەمبەر ( ﷺ ) هەواڵی خۆی و ژنەکەی پێدا پێغەمبەر ( ﷺ ) هێندە پێکەنی

هەتا دانەكانی بەدەر كەوتن [٢] (ابو يزيد السطامی) ووتی قەت كەس وەكو ئەو گەنجە لەسەرم زاڵ نەبوو كەبەسەرم زاڵ بوو ووتی ئەو گەنجە هاتە لامان دەچووە حەجێ ووتی ئەی (ابا يزيد) زوهد لای ئێوە چۆنە ووتم زوهد لای ئێمە ئەوەيە ئەگەر نانمان دەست كەوت دەخۆين وەئەگەر نەبوو سەبر دەگرين گەنجەكە ووتی سەگەكانی (بلخ)يش هەروانە جا ووتم ئەدی زوهد لای ئێوە چۆنە گەنجەكە ووتی ئەگەر خواردنمان نەبوو سوپاسی خوا دەكەين وەئەگەر بووشمان دەيبەخشينەوە.

## (سوننەتی هەینی)

سوننەته دوایی نوێژی هەینی دوو رەکات یان چوار رەکات نوێژ بکری ، ئەبو داود لە ئبن عومەر دەگێڕێتەوە ئەگەرنوێژە لە مزگەوت بکردایە چوار رەکاتی دەکردئەگەر لە ماڵوەبایە دوو رکاتی دەکرد ، لە بوخاری و مسلم هاتووە لە ئبن عومەرەوە کەوا پێغەمبەرﷺ دوو رەکات نوێژی لەماڵەوە دەکرد دوایی نوێژی جمعە ، بەڵام نوێژی سوننەتی پێش جومعە شێخ الاسلام ئیبن تمیمە وتی پێغەمبەرﷺ دوایە بانگدان پێش جومعە هیچ نوێژی نەدەکرد کەسێ لە پێغەمبەری ﷺ نەگێڕاوە تەوە کە نوێژی کرد بێ لەسەر دەمی پێغەمبەرﷺ بانگ نەدەدرا تاکو واتە ئیستا لەسەر مینبەر ئینجا بلال بانگی دەدا دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ دوو وتارەکەی دەخوێندەوە ئینجا بلال قامەتی دەکردن کەواتە کەس نوێژی نەدەکرد دوایی بانگدان نە بەخۆی وە نەیەکێك لە هاوەڵەکانی کەسیش لێ نەکێڕاوەتەوە کە نوێژ لەماڵەوە کرد بێ پێش دەرچوونی بۆ مزگەوت رۆژێ جومعە بۆیە جەماوەری زانایان یەك دەکەن لەسەر نەبونی سوننەتی پێش جومعە بە ژمارەیەکی دیاریکراو بە کاتێتیکی دیاری کراو . چونکە ئەمە بەقسەی پێغەمبە ﷺ یان بە کردەوەی جێگر دەبێ ئەویش ئەم سوننەتەی دانەناوە نەبەقسە وە نەبە کردەوە جێ ی سەر سەرمانە کە دەبینین زۆربەی بانگۆرەکان لی رۆژی جومعە دەڵێن نوێژی سوننەتی جومعە بکەن ، کە ئەمەش بیدعەیە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێش جومعە نوێژی نەکردووە بەڵکو دوایی جومعە نوێژی کردووە .

## به شێك لە سفور

خوای گەورە دەفەرمووێ ( ولا تبرجن تبرج الجاهلیة الاولی ) سورتی ئەحزاب ئایەتی (٣٣) واتە جوانی خۆتان بە دیاری مەخەن بۆ خەڵکی بیگانە هەر وەکو چۆن لە سەر دەمی جاهلی و نەفامیپێش ئیسلام ئەو کارە دەکرا ئەوە فەرمانی خوایە بۆ ژنانی موسلمان ئەو خوایەی کە دروستی کردون و ڕۆزیان دەدات لە گەڵ ئەمەش زۆر ئافرەت هەنە کە بە نفوس موسلمانن بەلام پێچەوانەی فەرمانی خوا رەفتار دەکەن و لە هەرەشەی خوا ناترسن هەروەك کە گوێیان لەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) نەبووە کە باسی ئەو دوو کۆمەڵەی دەکات کە هێشتا نەی دیون و بە ئاگری دۆزەخ دەیان ترسێنێ کە یەکێك لەم دوو کۆمەڵە ئەو ئافرەتانەن جلکیان لەبەرە بەلام لە شێن بە تەواوی دانەپۆشیون واتە ئەندامەکانی لە شیان بەدەرەوەیە یا لە ژێرەوە دیارە وە هەروەها سەرو قژیان بە دەرەوە یە قژیان وەکو سەرپشتی ( دونگ ) حوشتریان لێ کردووە بۆ سەرنج ڕاکێشانی پیاوی بێگانە . ئەگەر لە سەر ئەو نەفامیە بەردەوام بن هەتا مردن ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای ای کردوین لەعنەتیان لێ بکەین واتە بێبە بن لە رەحمەتی خودلو بەهەشت چونکە ئەوانە خۆیانیان بێ بەش کردووە بەو یاخی بوونە وە ئەوەی یارمەتی دەروهاندەری گەشەسەندنی جوانی دەرخستن و سفوری ئافرەتانە و وایان لێ دەکات لابدەن لە پەیڕەوەو کردنی قورئان و سوننەت ، بلاوبونەوەی جێگای تایبەتی بۆ رازندنەوەی ئافرەتان لە شارەکان کە کچان و ئافرەتان هاتو چۆی ئەم شوێنانە دەکەن لە والنەیە باوك و براشیان ئاگادارن دووریش نیە ئەم باوك و برایانە هاتوچۆیی مزگەوتیە بکەن و نوێژ بکەن بەلام بێ ئاگانە لەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرمووی ( دەیوس ناچێتە بەهەشت ) دەیوس واتە بێ غیرەت و ڕازی بەکاری خراپی ئافرەتی ماڵەوە . لەم سالۆنانە لەوانەیە بەلاو کاری ناڕێك ڕوو دەدات بێجگە لەسەرف کردنی پارەیەکی زۆر بۆ گۆرینی دیمەنی سەرو دەم و چاوی بەتایبەتی لە کاتی ژن مارە کردن و گواستنەوە کە بووك دەرازێننەوە ئینجا لە گەڵ خوشکەکان و خزمەکانی لە سەر حسابی گیرفانی زاوا . جارێکیان سەیارەکانی دوو بووك ئەوەندە زۆر بوون کە ڕێگەی بەردەم سالۆنێکیان گرتبوو لە تێپەڕبوونی سەیارەی خەڵکی تر بۆ ماوەی سەعاتێك دوو سەعات کە ئەمەش ئازار دانی خەڵك حیسابەو چەندەها جار دووبارە دەبێتەوە وە ئەوەی لێرەدا پێویستە بووترێ ئە سیفەتە یەکجار ناشیرین و دوور لە ئیسلامیە لەو خەلکانەی بە دوایی بووك دا دەڕۆن بە هۆرن لێدان و بەخێرایی کە زۆر جار دەبێتە هۆیی سەیار لێکدان و ئازارو ناخۆشی یان خۆ دەرهێنان و دانشتن لە سەر دەرگای سەیارەو پەڕۆك هەلوەشاندن بۆ لاسایی بێگانەکان دەکەینەوە لە کاری خراپ لە سزاو توڕەبوونی خوای گەورە ناترسین بۆ ئەگەرێنەوەبۆ ڕێنمایی دینە پاکەکەمان کە سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشیە وچاو لە پێغەمبر (ﷺ) بکەین لە هەموو کارو کردەوەکان دا ( لقد کان لکم فی رسول الله اسوة حسنة )

## ئاگاداری -

خەڵك لە هەندی لە مزگەوتەکان هەڵدەستن بە دروست کردنی هۆڵی گەورە بۆ تازیە و بۆنەکان ئەم کارەش پەسند نیە لە بەر چەند هۆیەك لەوانە داگیر کردنی زەوی مزگەوتەکە یە هەروەها بەکار هێنانی ئاو کارەبا کەیەکێ جگە لەبەکار هێنانی کەل و پەلی تری مزگەوت وەکو مەبرەد سۆبە لە والنەیە بەکار نەهێنرێت بۆ مزگەوت بەتایبەتی لە کاتی ووتاری هەینی بۆ ماوەی کات ژمێرێك یان دوان بەلام بەکار دەهێنرێت سێ چوار ڕۆژ لە دوایی یەك بۆ تازیە دانان خۆزگە ئەم هۆلانە دروست دەکران دور لە مزگەوت و دوور لەئاو کارەبا و کەل و پەل و زەویەکەی

# ناوەرۆك

تەماشاکردنی ئەو هەموو بیدعەیەی کە لە نێوان موسلمانان بلاو بۆتەوە لە بەندایەتی کردن کارو کردەوەی و لاسایی کردنەوە کە کردویانەتە ئاین . وئاینیش لێ یان بریە ، وە هەمووتان دەزانن هەرچی لە قورئان و سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتووە هەر ئەوە ناوەرۆکی ئایینە بەڵام زۆر بەداخەوە هەندی کەس دەبینین پرۆگرامی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەستۆ ناگرن وەکو پێویست بەڵکو خۆیان بە لاسایی کردنەوە و عادەت و بیدعە وەرگرتووە کە پێچەوانەی ئاینە کە چی بەئایینی تیٚ دەگەن ، بۆ نمونە وەکو ئەو شتانەی ئەمرۆ لە نێومان دەکرێ لە رێ و ڕەسمی تازیە دانان و رێزنەگرتنی مزگەوت و گۆر بەگەورەتن و جگەرە خواردن و کردنی هەموو جۆرە یارچی یەك و داهێنانی جۆرە سۆفی بابەتێك کە لەگەڵ شەرع رێك ناکەون دەفە لێدەدەن شیر لە خۆ دەدەن زۆر شتی تر کە هیچ ئەسلێکی لە ئیسلامدا نیە ، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو شتانەی کە شەرع فەرمانی بە کردنیان داوەو بە باشیان دەزانی وەکو رووکردنە خاو بە دڵسۆزی لە هەموو کراو کردەوەیکدا بە جیٚ هێنانی پێویستی بیەکانی بە بیٚ هاوبەش پەیدا کردنی شاراوە یان لە خوا ترسان بە دڵ لە ناو نوێژدا کە گیانی نوێژە وەیان کارو کردەوە کردن بەدەقی قورئان و سوننەتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) تا وای ویٚ کردە وە کردن بە قورئان و سوننەت زۆر دەبیٚ و بیدعە کردن کەم دەبێتەوە بەڵیٚ زۆر جاران وە بە خۆبە قورئان و سوننەت بەستانەوە لای هەندیٚ کەس بەشتەکی نامۆو . دوور لە دی دێتە ژمار ئەوەش رەنگدانەوەی ساردێنی خەلکەکیە بەرامبەر بە ئاین